


# کانیاوی ڕەحمەت

## چەند دڵۆپێ لە فەرمایشتە شیرینەکانی حەزرەت

سەلامی خوا لە خۆی و سەرجەمی پێغەمبەران



کاک شێخ

# کانیاوی ڕەحمەت

## چەند دڵۆپێ لە فەرمایشتە شیرینەکانی حەزرەت

سەلامی خوا لە خۆی و سەرجەمی پیغەمبەران

٢٠١١ زایینی چاپی یەکەم ١٤٣٢ کۆچی

ناوی کتێب: کانیاوی ڕەحمەت

نووسەر: **کاک شێخ**

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم

ساڵی چاپ: ٢٠١١

ژمارەی سپاردن: (١٠٦) ساڵی ٢٠١١ ی زایینی دراوەتێ

تیراژ: ( ١٠٠٠) دانە






م: ٠٠٩٦٤ ٧٥٠ ٤٩١ ٥٥٩٧

ئیمەیڵ: kakshekh@gmail.com

« إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا » (٥٦ الأحزاب)

« لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ » (التوبة ١٢٨)

« وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ »

الانبياء (١٠٧)

« وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ »

القلم (٤)

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ

« إِنَّ الْعَبْدَ لَيَبْلُغُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ »

(المعجم الاوسط)

واتە: بـێ گومـان و زۆر بـە دڵنیاییـەوە بەنـدە بـەهۆی ڕەوشـتی جـوانی یـەوە دەگاتـە پلەوپایـەی ئەوکەسـەی کـە هەمیـشە بەڕۆژووەو، بەهەمیشەش شەو بێدارەو (شەو نوێژ دەکا).

# پێشکەشە

بە گیانی پاکی خۆشەویستمان.

ڕۆشنایی دڵ و دیدەمان، سەرمەشق و ئوستادی دین و ژینمان ، ڕابەر و ڕێنیشاندەری دونیاو دوارۆژمان ، کە جوانترین نموونەی مرۆڤایەتی یەو بەکۆچی دوایی و ماڵئاوایی کردنی: بوونەوەر بەگشتی و مرۆڤایەتی بەتایبەتی بەنرخترین سەرمایەی مەعنەوی لەدەستدا ..

## پێشەکی

بەناوی خودای گەورەو میهرەبان

دروودی بێ پایانی خودا بڕژێ بەسەر سەرداری مرۆڤایەتی، کە یەکپارچە نوور و ڕەحمەت بوو بۆ تەواوی جیهانییان.

١- ئەگەر پەیام و پەیامکاری بریتی بێت لەو بیرو بەرنامەو بینشەی کە مرۆڤ باوەڕی پێی هەیە و کەم و زۆر هەوڵیداوە لە خۆیدا ڕەنگیان پێ بداتەوەو دواتر بەگوفتارو ڕەفتاریا بیانناسێنێتەوە بەخەڵکانی تر، ئەوا پەیامی پێغەمبەران (سەلامی خودایان لەسەربێت) جوانترین و تەواوترین و سەلامەتترین و ڕۆشنترین و ئارامی بەخشترین و ڕێك وپێکترین بەرنامەو پەیام بووینە لەمێژووی مرۆڤایەتی و هەمیشە زۆرترین سوودو قازانجی ماددی ومەعنەوی ودونیایی و دواڕۆژییان بەمرۆڤەکان بەخشیوە، هۆکارەکەشی ئەوەبووە کە خودی پەیامەکە هی خودا و خالقی مرۆڤەکان بووەو بەڕاستیش هەر ئەو لە هەر دروستکراوێکی تر باشتر دەزانێ چی باش و گونجاوە بۆ مرۆڤەکان.

٢- پەیامی هەموو پێغەمبەرانیش پڕە لە (مبادیء = بنەما) و دەستوور و یاسای ڕێك وپێکی وەها کە لەگەڵ فیترەتی مروڤا هەماهەنگەو چەشنی بەرنامەیەکی تێرو تەواو ڕێك وپێکی بە ژیان دەبەخشن و بەهۆیانەوە مروڤەکان دەتوانن سەرجەمی پەیوەندییەکانیان ڕێك بخەن

و بێ کێشەو بێوەی و سەلامەت و بە ئەوپەڕی دڵارامییەوە زیندەگی بکەن لە دونیادا.

٣- قەدەری بەخێری ئێمە هەماهەنگە لەگەڵ سەرداری پێغەمبەران (محمدی خۆشەویست) و تەواوترین پەیام و بەرنامەی خودا کە (قورئانە)، قورئان پڕاو پڕە لە یاساو ڕێسای تۆکمەو ژیانبەخش و ڕێکخەر بۆ دونیاو دواڕۆژی مرۆڤەکان و، خۆشەویستیش جوانترین و هەستیارترین نموونەو پێشەنگی ئەو پەیام و بەرنامەیە بوو لە جێبەجێ کردنا، بە چەشنێك تەواوی هەست ونەست و دڵ وگیان و هەڵوێست و هەڵسوکەوت و گوفتارو ڕەفتاری ڕۆشنکەرەوەی پەیام و بەرنامەکەی خودا بوو، پێغەمبەرێکی مەزنی وەها کە هەم ڕابەری گۆڕانکاری بوو لەخۆی و هەم ڕێنیشاندەری گۆڕانکاری بەخێری دەروونی و ژیانیش بوو بۆ مرۆڤایەتی.

٤- مرۆڤەکان دابەش دەبنە سەر سێ چەشنە کەسایەتی بنەڕەتییەوەو هەر یەکەشیان خاوەن خەسڵەت و ئاکاری تایبەتمەند بە خۆیانن، ئەوانیش بریتین لە (کەسایەتی پەیامدارو مەبدەئی، کەسایەتی تێکەڵ لە پەیام و میزاج، کەسایەتی میزاجی).

یەکەم: کەسایەتی پەیامدارو مەبدەئی، ئەو کەسایەتییەیە کەتەواوی پەیامەکانی خوداو خۆشەویستی کردۆتە بەرنامەی ژیانی و بەپێی یاساو ڕێساکانی ئایین لەگەڵ تەواوی بوونەوەران بە گشتی و مرۆڤ بە تایبەتی مامەڵەو هەڵسوکەت دەکات و، وەختێ ڕووبەڕووی هەرشت و

ڕووداوێکی خۆش یان ناخۆشی ژیان دەبێتەوە بەپێی پەیام و ڕێنماییە ئایینیەکان هەڵوێست دەنوێنێت.

دووەم: کەسایەتی تێکەڵ لەپەیام و میزاج، بریتیە لەو کەسایەتییەی کە لەهۆش ودڵ و دەروونیا باوەڕی بە جوانی و حەقیقەتی پەیام و یاسا و ڕێسا ئیلاهییەکان هەیەو زۆریشیان پێ جوانە، وەلێ بەپێی پێویست ئیشی لەسەر دڵ و دەروونی خۆی نەکردووەو نەیتوانیوە تەواوی بنەماو فەرمانەکان لەدڵیدا جێنشین بکات و سەرجەمیان ڕەنگ پێ بداتەوە لە واقیع و ژیانی خۆیدا، بۆیە لەکەوتنە ناو ڕووداوەکان و ڕووبەڕووبوونەوەی ژیان هەرجارەی بەجۆرێك و لەهەرکات و شوێنێك بەچەشنێك مامەڵەو هەڵسوکەوت دەکات، هەندێ جار پەیامدارانەو بە پێی فەرمان ویاساو ڕێساکانی ئایین وهەندێ جاریش بەپێی میزاج و بەرژەوەندییەکانی خۆی.

سێیەم: کەسایەتی میزاجی، بریتیە لەو کەسایەتییەی خاوەنی هیچ یەکێ لە بنەماو پەیام و ڕێساو یاسا ئایینیەکان نییەو ئەگەر بەهۆش و بیریش باوەڕی پێیان هەبێت و جوان و ڕێك وپێك بن لەلای بەلام هەرگیز لە دڵ و دەروون و لەکردارو ڕەوشتیا جێگیری نەکردوون و هەرگیز بەپێی ڕێنماییە ئیلاهییەکان مامەڵەو هەڵسوکەوت ناکات و بەپێی بەرنامەیەکی تۆکمەو شایستە کە بۆمرۆڤ دانراوە ڕووبەڕووی ڕووداوە خۆش یان ناخۆشەکانی ژیانی نابێتەوە، بەواتا کەسێکی میزاجی بەرژەوەندخوازی خۆویستی وەهایە هەموو دونیای تەنها

بۆخۆی دەوێت و هەمیشە بەپێی بەرژەوەندییەكانی مامەڵەو هەڵسوكەوت دەكات، كەسایەتییەكی ناجێگیری نادڵارامی وەها كە لەسەر هیچ بناغەیەكی ئینسانی نەوەستاوەو خۆشی سەری لەخۆی دەرناچێت و خەڵكانیش دەبستەوەستانن لە هاودەمیكردنی، چونكە شتێك نییە پێی بناسرێتەوەو بیرو باوەڕو بەرنامەیەكی ڕۆشن نییە كۆنترۆڵی ژیان و هەڵوێستەكانی بكات...

بەپێی ئەم پێناسانەی سەرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی كەمرۆڤ هەتا لە پەیام وبنەماكان نزیك بێتەوەو كاریان پێ بكات ئەوەندە لەمیزاجییەت دووردەكەوێتەوەو رزگاری دەبێت لێی، هەتا لەمیزاجییەت و بەرژەوەندخوازی وخۆویستیش نزیك بێتەوە ئەوەندە لەپەیامداری دووردەكەوێتەوەو خۆی و خانەوادەو خەڵكانی كۆمەڵگاش سەرگەردان دەكات.

٥- ئەگەر ئایین دابەش ببێتە سەر چەند بەشێكی سەرەكی و گرنگترینیان بریتی بن لە: ئیمان و عیبادات و ئەعمال و ئەخلاقیات و ئەحكام و(بەشی تۆڵە و سزاكان)، ئەوا تەركیزی ئێمە لەم پەرتووكەدا لەسەر بەشی ئەخلاقیاتە (ڕەوشتەكان) و گرنگی تەواومان بەو بەشە داوە، بەو پێناسەیەی كە ئەخلاق بریتی یە لەو بەها جوانە ڕێك وپێكە ئینسانییانەی كەتەواوی مرۆڤەكان كۆكن لەسەر باشی و جوانییان و كۆكن لەسەرئەوەی كەهەڵگرو خاوەنانی ڕەوشتە جوانەكان كەسانێكی چاك و پاك و سوودمەندن و كەسایەتییەكی بەرزو

شکۆمەندو کاریگەرو درەخشانیان هەیە، چونکە خاوەنانی ڕەوشتە جوانەکان هەروا بەسادەو ساکاری و بێ زەحمەت و گیروگرفت نەبوونەتە خاوەن ناسنامەی ئەم ڕەوشتانە، ئەوان زووتر تەواوی ڕەوشتە جوانەکانیان ناسیوەو دواتر باوەڕیان بەحەقیقەت و چاکی وپاکی و ڕێك وپێکییان هێناوەو بەگرنگیان زانیوە، دواتر لەدڵدا خۆشیان ویستووەو پەرۆشی و جۆش وخرۆشی دەروونییان تاوی سەندووە بۆیان و، پاشان بڕیاریان داوە لەدڵ و گیان و هەست و نەست و گوفتارو ڕەفتارو تەواوی وجوودیان جێ نشینی بکەن و لەترۆپك و لوتکەی ئاستەکانیان ڕەنگیان پێ بدەنەوە لە واقیع و ژیانیاندا، پاشان هەنگاویان بۆ هاویشتووەو پلەبەپلە بە (تیکرار و بە تەدریج) و بەنەفەسێکی فراوان و کات و تەمەنێکی درێژخایەن دانەدانەی ڕەوشتەجوانەکان و ئاکارە بەرزەکانیان لەدڵ و دەروونیاندا جێ نشین کردووە، بە چەشنێك هەریەکێك لەوان بۆتە مەلەکە تیایانداو بۆتە بەشێکی دانەبڕاو لەجەستەو دڵ و گیان و کەسایەتییان و وەك خەسڵەتگەلێکی تایبەتمەند پێیان دەناسرێنەوە.

٦- کردەوە و ڕەوشت لەشتە دەرەکییەکان و نمایشە جەستەییەکانا هاوشێوەن، بەڵام مەرج نییە لەهەڵوێستە ناوەکییەکان و باوەڕە دەروونییەکانا هاوچەشن بن، هەرچی کردارە دەشێ لە جوانترین شێوەی دەرەکییا ئەنجام بدرێت و خاوەنەکەشی لەدڵ و دەروونییەوە هیچ پێی خۆش نەبێت و لەڕاستییا جاری واهەیە هەر باوەڕیشی پێی

نەبێت، کەچی لەبەر هۆکارێك لەهۆکارەکانی بەرژەوەندئامێزی ماددی یان مەعنەوی ناتەندروستی خۆی ئەنجامی بدات و تا ئاستێك ستایشی خەڵك و کۆمەڵگاش بۆخۆی دەستەبەر بکات، وەلێ ڕەوشت سەرچاوەو کانیاوەکەی لەدڵ و دەروونی خاوەنەکەیەوە هەڵدەقوڵێت و تاسەرئێسقان باوەڕی پێی هەیەو زۆریش خۆشی دەوێت و بەئەوپەڕی پەرۆشی و خۆشحاڵییەوە لەکردەوەیدا ئەنجامی دەدات و بوونەتە بەشێك لەپێکهاتی وجوودی ڕاستەقینەی و ناکرێت و ناتوانێت ئەنجامیان نەدات، لەڕاستییا ئەگەر بەرژەوەندییە ماددی و مەعنەوییەکانیشی بکەوێتە مەترسییەوە ئەوهەر ئەنجامیان دەدات و بەرخاتری هیچ (ترس یان بەخشینێکی ماددی یان مەعنەوی) کۆڵیان لێ نادات.

٧- ئەگەر فەرمانی شوێنکەوتن لەئایەتی (قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ) (ال عمران ٣١) بریتی بێت لەشوێنکەوتن و چاولێکردنی تەواوی بەشەکانی ئایین کە بریتی یە لە (ئیمان و عیبادات و ئەعمال و ئەخلاقیات و ئەحکام و بەشی تۆڵەو سزاکان) ئەوا بەداخەوە ئێمەی دینداران تەنها لەبەشی ئیمان و عیبادات خۆمان قەتیس کردووەو بەشەکانی ئەعمال و ئەخلاقیات و ئەحکام و ڕازیبوون بەتۆڵەو سزاکانمان فەرامۆش کردووەو هەوڵمان نەداوە لەوانیش شوێنکەوتەی پێشەوا ڕاستەقینەکەمان بین کە خۆشەویست و نووری چاومان

(محمد المصطفى) يە، زۆر گرنگە لەمەولا هەولْ بدەين شوێنكەوتەى ئاكارە بەرزەكانيشى بين و وردە وردە چاولێكەرى بكەين لەڕەوشتە بەرزەكانى چەشنى (ڕاستگۆيى و ئەمينى و دڵنەرميى و لێبوردەيى و ئازايى وسەربەرزيى و فيداكاريى وهيممەتبەرزيى و بەخشندەيى و هاريكاريى و خۆنەويستى و وەفادارى و دەستپاكى و دڵسافى و حەكيمى و ميهرەبانى و دڵسۆزى و دەيان و سەدان و هەزاران ڕەوشتى بەرزو جوانى تر كە تاسەرئێسقان گرنگن بۆ ژيانى مرۆڤ و بەهۆيەوە سەربەرزى دونياو ڕزگاربووى دواڕۆژ دەبين و ڕەزامەنديى خوداو، خۆشەويستى و هاودەميى پێغەمبەريش (سەلامى خوداى لەسەربێت) بەدەست دێنين، بەڕاستى ڕەوشت هيچى كەمتر نييە لە عيبادات و بەڵكو هاوشانيەتى و لەئەنجامدانا ئاسانتريشە لەئەو، بەسسە كەخۆشەويستمان بفەرموێ: (مرۆڤ بە ڕەوشتى بەرزو جوانيەوە دەگاتە پلەوپايەى كەسانێك كە بەڕۆژ هەر بەڕۆژوون و بەشەوانيش هەر بێدارن و شەونوێژ دەكەن)، يان كەدەفەرموێ: لە ئێوە خۆشەويسترين و نزيكترين هاودەم و هاومەجليسم لەڕۆژى دواييدا ئەوەتانە كە ڕەوشت جوانترين و ئاكار بەرزترينتانە.

٨- ئەو پەرتووكەى بەردەستت كە بريتى يە لە (كانياوى ڕەحمەت) و چەند دڵۆپێكە لە فەرمايشتە شيرينەكانى خۆشەويستمان: هەوڵێكە بۆناساندنى پەيام و بنەما سەرەكييەكانى ئايين لەبەشى ئەخلاقيياتا، واتە ئەو ڕەوشتە بەرزو بەڕێزانەى كە پەيوەندييە كۆمەڵايەتييەكان

ڕێك دەخەن وئەرك و مافەكانی باوەڕداران لەناو خۆیاندا دیاری دەكەن.

٩- جیاوازی ئەم پەرتووكە لەگەڵ پەرتووكە بەنرخەكانی ترا كە برایانم ماندووبوونیان لەپێناودا هەست پێكردووەو وتە شیرینەكانی خۆشەویستیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی كوردی و كۆمەڵگای كوردەواری موسڵمانی خۆمانیان پێ دڵارام كردووە ئەوەیە كە هی ئەوان فەرموودەكان هەمەچەشنی بوارەكانی ئایینن، واتە هەم بەشی ئیمان - هەم بەشی عیبادات - هەم ئەعمال - هەم ئەخلاقیات - هەم ئەحكام - هەم بەشی تۆڵەو سزاكانیان تێدایەو بێ لەبەرچاوگرتنی بەرنامەیەكی دیاریكراو فەرموودە شیرینەكانیان لەتەك یەكترا ڕیز كردووە، وەلێ ئەم پەرتووكە تا لەتواناادا بووبێ هەوڵی بۆ دراوە ئەو فەرمایشتە بەنرخانە لەخۆ بگرێت كە پەیام و بنەمای پتەویان تێدایەو بەكەمترین ئامـاژە زۆرترین مانـاو مەبەستیان گەیاندووە، واتە زۆرینەیان مەتنن و خوێنەران (باوەڕداران) خۆیان دەبنە شاریحیان و بەهەڵسوكەوت پێكردن و مامەڵەی ڕۆژانەو ژیانی دونیایی ودینییان ماناكانیان باشتر ڕۆشن دەبنەوە بۆیان..

١٠- جاروبارێك لێرەو لەوێ چەند فەرموودەیەكی شیرین دەربارەی گەورەیی وشكۆمەندی خۆشەویست و دڵسۆزی بۆ ئوممەتەكەی: خۆی خزاندۆتە نێو ڕیزی فەرمایشتە مەبدەئی و ئەخلاقییەكان و گوڵشەنی فەرموودەكانی ڕازاوەتر كردووە.

١١- لە وەرگێڕانی فەرموودە شیرینەکانا پشتم بە مانای حەرفی و ڕووکەشیی نەبەستوەو نەمهێشتوە ئاسان کۆت و بەندەکانی زمان دیلم بکەن، هەوڵم داوە مانای حەقیقی و داواکراو (مطلوب) ی فەرمایشتەکان وەربگێڕم و بۆ ئەم مەبەستەش زۆرجار وشەو ڕستەی زیاد کراو کەوتۆتە ناو وەرگێڕانەکە، بەڵام نەك هەر لە ماناکە لاینەداوەو زیانی بە پەیام و بنەماکە نەگەیاندووە بەڵکو بۆتە مایەی ڕۆشنکردنەوەی ناوەڕۆکەکەشی ...

١٢- هەرچی تەواوی و جوانییەك کەتێی دابێت لەخواوەیەو هەرچی ناتەواوی و ناشیرینییەکیش کەهەیبێت لە منەوەیەو، ئومێدەوارم خودای گەورە بیکاتە توێشوویەکی بەسوودو ڕزگارکەر لەڕۆژێکا:

(يَوْمَ لَا يَنْفَعُ مَالٌ وَلَا بَنُونَ، إِلَّا مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ)

{ ٨٨+٨٩ الشعراء }...

خوایەگیان بەر لەهەرشت بە لوتف و ڕەحمەتی هەمیشە ڕژاوی خۆتەوە، دواتر بەهۆی کردەوە جوانەکان و ڕەوشتە پەسندەکانەوە جوانی ببەخشە بەسیمامان و، بەهۆی یادی بەردەوامی خۆت و موناجاتی گەرم وگەش و دووبەدوویی شیرینتەوە ئارامی ببەخشە بە دڵەکانمان و، بەهۆی دڵی پڕ لەکوڵ و عەشق و مەحەببەت و ئەوینی ڕاستەقینەی خۆت و حەزرەت گیانیشەوە بمانکە ئەنیسی خۆت و، براو هاودەم و هاوڕێی گیانی بەگیانی (خۆشەویست) مان لە دونیاو دواڕۆژدا...

وصلى الله على سيدنا وحبيبنا وقرة أعيننا وطبيب قلوبنا وشفيع ذنوبنا محمد وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى إخوانه الكرام من الملائكة والمرسلين، وعلى جميع أصحابه المحبوبين من الأنصار والمهاجرين، وعلى جميع أتباعه المخلصين من الصديقين والشهداء والصالحين، وعلى جميع أوليائه في كل زمان وفي كل مكان الى يوم الدين.

کاک شێخ

هەولێر

١. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَا مِنْ شَيْءٍ أَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ » (أبي داود)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:**

**هیچ شتێك ئەوەندەی ڕەوشت جوانی گران و سەنگین نیە لەسەر تەرازوو، لە ڕۆژی دوایی دا.**

٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« الْمُؤْمِنُ مَنْ أَمِنَهُ النَّاسُ عَلَى أَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ الْخَطَايَا وَالذُّنُوبَ » (إبن ماجة)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:**

**باوەڕداری تەواو ئەوکەسەیە کە هەمووخەڵکی لەماڵ و گیانیان لێی ئەمین و پارێزراوبن، کۆچکەر (موهاجیر)یش ئەوکەسەیە کە هەڵەو گوناهان جێ دەهێڵێ و کۆچیان لێ دەکات.**

٣. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ » (متفق عليه)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:**

**هیچ یەکێك لەئێوە باوەڕی تەواو نابێت هەتا چی بۆخۆی پێ خۆشە بەهەمان شێوە بۆ برای ئیمانداریشی پێ خۆش نەبێت.**

٤. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« الْمُسْلِمُ: مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُهَاجِرُ: مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ » (البخاري)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ: موسڵمان ئەوکەسەیە کەسەرجەمی موسڵمانان هەم لەزمان و هەم لە دەستی بێ زیان و سەلامەت بن، کۆچکەر(موهاجیر)یش ئەوکەسەیە کەپشت دەکاتە ئەوشتانەی خودا قەدەغەی کردوون و، کۆچیان لێ دەکات.**

٥. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلَا يُؤْذِ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ » (البخاري)

**واتە: خۆشەویستمان سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ: هەرکەس باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە با ئازاری دراوسێی نەدات، هەرکەس باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لەمیوانی بگرێت، هەرکەس باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە با یان قسەی چاك و خێر بکات یان بێدەنگ بێ.**

٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« إِنَّ الْعَبْدَ لَيَبْلُغُ بِالحِلمِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ ». (المعجم الاوسط)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی:
(بێ گومان مرۆڤ بەهۆی خۆگری و ئارامی و میهرەبانییەوە دەگاتە پلەوپایەی ئەوکەسەی کە هەمیشە ڕۆژووەوان و بەهەمیشەش شەو بێدارە).

نموونە//

جوولەکەیەك سەرسام ببوو بەڕەوشتە جوانەکانی خۆشەویستمان، هەموو ئاکارەکانی تاقی کردبۆوە تەنها(حیلم – خۆگری و ئارامی و میهرەبانی) مابوو، بڕیاریدا ئەویشی لەگەڵ تاقی بکاتەوە، نوێنەرێکی هەژارنشینی دێهاتەکان هاتبووە لای خۆشەویست و سکاڵای حاڵ و برسێتی وپێویستییەکانی ژیانی خۆیانیانی بۆدەکرد، خۆشەویستیش دڵی بۆیان پڕبوو وەلێ شتێکی شایستەی شك نەدەدی بۆیان خەڵات و ڕەوانە بکات، ئەم پیاوە جوولەکە ئەم ڕووداوەی بەهەل زانی و گوتی ئەی محمد من ئەو بڕە پارەیەت بەقەرز دەدەمێ تا خورما پێدەگات یان تا غەنیمەتێکتان دەست دەکەوێت، خۆشەویستیش قبووڵی کردو بەبەرچاوی ئەوەوە هەموو پارەکەی بەخشی بەنوێنەرەکەو وتی بچۆ بەدادگەریی بەسەریاندا دابەشی بکە، کەچی دواتر کابرای جوولەکە لەپەیمانەکەی خۆی پاشگەز بۆوەو زۆر زووتر لەوەی وادەی

بڕیاردراوی بێت: لەکاتێکا خۆشەویست و یاران خەریکی ناشتنی مردووێك بوون لەگۆڕستانا هات و یەخەی خۆشەویستی گرت وبێ سەلام و هەواڵ پرسیی وتی: ئەی (موحەممەد) ئەو قەرزەی لەلاتە بمدەرەوە، خۆشەویست فەرمووی: بەڵام خۆ هێشتا ماوەی دیاریکراوی نەهاتووە !، جوولەکەکە بەهەڵی زانی و وتی: ئێوەی (بەنی هاشم) هەمیشە وا قەرز کوێرن و حەق و پارەی خەڵکی نادەنەوە، ئیمامی عومەر لە کابرای جوولەکە تووڕە بوو و ویستی لێی بدات، بەڵام خۆشەویست فەرمووی نا ئەی عومەر، چاکتر وایە بەمن بڵێی قەرزەکەی بدەرەوەو بەویش بڵێی بەشێوازێکی جوان و لەکاتی خۆیدا داوای بکەوە، بچۆ لەگەڵی ئەی عومەر قەرزەکەی بدەرەوەو ئەوەندە سەبەتە خورمایەشی زیادە بەخەڵات بدەرێ هەقی ئەوەی چاکەی لەگەڵ کردووین و پارەی بەقەرز داوینەتێ، کابرای جوولەکە کە ئەم ڕەوشتە جوان و ئاکارە بەرزو بەڕێزەی بینیی دەست بەجێ موسڵمان بوو و ڕایشی گەیاند کە ئەم کارەی تەنها بۆ تاقی کردنەوە ئەنجام داوە..

٧. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« أَنَا زَعِيمٌ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَإِنْ كَانَ مُحِقًّا وَبِبَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْكَذِبَ وَإِنْ كَانَ مَازِحًا وَبِبَيْتٍ فِي أَعْلَى الْجَنَّةِ لِمَنْ حَسَّنَ خُلُقَهُ » (أبي داود)

**واتە: خۆشەویستمان سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی:ئەمن کەفیلی دابین بوون و دەستکەوتنی ماڵێکم لە لێوار و سەرەتاکانی بەهەشتا بۆ ئەو کەسەی کە واز لەمشتومڕی بیٚ ئاکامی دڵ ماندووکەر دەهێنیٚ ئەگەرچی خۆی لەسەر هەقیش بێت، هەروەها کەفیلی دەستکەوتنی ماڵێکم لە ناوەڕاستی بەهەشتا بۆکەسێك کە واز لەدرۆکردن دەهێنیٚ ئەگەر بۆ گاڵتەو پێکەنینیشی بێت، وەهەروەها کەفیلی دابین بوون و دەستکەوتنی ماڵێکم لە بەرزترین پلەو شوێنی بەهەشتا بۆ ئەو کەسەی کە ڕەوشتی خۆی جوان کردووە.**

٨. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرِ اللَّهَ » (سنن الترمذي)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرمویٚ:**

**ئەوەی نەیتوانی بێت سوپاسگوزاری خەڵکی بکات لەسەر ئەو چاکانەی کە لەگەڵیان کردووە ئەوا ناتوانیٚ سوپاسگوزاریی خوداش بکات بۆ ئەو نیعمەت و بەخششانەی کەپێی بەخشیوە.**

٩. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَحَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ، وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ ». (مسلم)

واتە: خۆشەویست و نووری چاومان سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ: هەر کەسێ خەم و گرفتارییەك لەسەر باوەڕدارێك لاببات لە دونیادا ئەوا خودا خەم و گرفتارییەك لەخەم وگرفتارییەکانی ڕۆژی دوایی لەسەر ئەو لادەبات، وە هەریەکێك بارسووکی بکات بۆ کەسێك کەباری قورسی ژیانی کەوتۆتە سەرشان (بەتایبەت قەرزو، مۆڵەتپێدانی زیاترو لێخۆشبوونی) ئەوا خوداش هەموو بارسووکی و ئاسانکارییەکی بۆ دەکات لەدونیاو دواڕۆژدا، وە خودا بەردەوام لە هاوکاری و یاریدەیی بەندەکەی دایە هەتا ئەو لەهاوکاری و یاریدەیی برا (ئیماندارەکەی) دابێت، وە کەسێك ڕێگایەك بگرێتەبەرو بەهۆیەوە زانست و زانیاری دەستکەوێ ئەوا خودای گەورەش بەهۆی ئەم

زانست و زانيارييەوە ڕێگای چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەكات، وە هەر كۆمەڵە كەسێكيش كۆببنەوە لەماڵێك لەماڵەكانی خودا و كيتابی خوا بخوێننەوەو تاوتوێی بكەن لەنێوانی خۆياندا ئيللا سوكنايی و ئارامیی ئيلاهييان بەسەردا دەبارێ و ڕەحمەتی خوا دايانده‌پۆشێ و مەلائيكەتانيش دەوريان دەدەن، وە خودا باسيان دەكات لەكۆڕی ئەو مەلائيكەتانەی كە لەلای خۆيين، هەركەسێكيش كردەوەی خۆی دوای خستبێ ئەوا ڕەچەڵەك وبنەماڵەكەی خێراو (لەپێش)ی ناكات.

١٠.قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« فَمَا تَعُدُّونَ الصُّرَعَةَ فِيكُمْ؟ قَالُوا: الَّذِى لاَ تَصْرَعُهُ الرِّجَالُ، قَالَ: لَيْسَ بِذَاكَ، وَلَكِنَّهُ:الَّذِى يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ ».(السنن الكبرى للبيهقى)

واتە: خۆشەويست سەلامی خودای لەسەربێت بەهاوەڵانی فەرموو: ئێوە كێ بە زۆرانبازو پاڵەوانی بەهێزو توانا دادەنێن لەناو خۆتانا؟ وتيان: ئەو كەسەی كە كەس لە ئەرزيی نادات، فەرمووی: نەخێر ئەوكەسە نيە كەئێوە دەيڵێن، بەڵكو پاڵەوان و زۆرانبازی بەهێزو توانا ئەوكەسەيە: كە لەكاتی تووڕەييدا خۆی دەگرێت و بەسەر دەروونی خۆيدا زاڵ دەبێت و ناهێڵێ هەڵوێستی ناشايستەی لێ بكەوێتەوە.

١١. قَالَ رَسُولُ اللّهِ صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« أَدِّ الأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ وَلاَ تَخُنْ مَنْ خَانَكَ » (سنن أبي داود)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرمووێ:**

**سپاردە (ئەمانەت) بگێڕەوە بۆ خاوەنەکەی، هەرگیزیش خیانەت مەکە، هەتا لەگەڵ ئەو کەسەش کەخیانەتی لەگەڵ کردووی و خیانەتت لەگەڵ دەکات.**

**تێبینی // ئەمانەت بریتی یە لەهەرشتێك (ماددی بێت یان مەعنەوی) کە بکەوێتە لات و لەسەرت بێت بیپارێزی و ڕۆژگارێك وەکو خۆی بیدەیتەوە دەست خاوەنەکەی، ئایین ئەمانەتە لەلامان، خۆمان ئەمانەتی خواین لەلای خۆمان، تەمەن ئەمانەتە لەلامان، ژیان ئەمانەتە لەلامان، وتەو نهێنییەکانی هەرکەسێك ئەمانەتن لەلامان، کەل و پەلە جێهێشتراوەکانی خەڵکانیش ئەمانەتن لەلامان....**

**ئەم فەرموودەیە حاڵییمان دەکات کە ئەمانەتەکان وەکو خۆیان بگێڕینەوە بۆخاوەنەکانیان و، هەرگیزیش هەڵەو تاوانی خەڵکی ڕێگەمان بۆ خۆش نەکەن و مۆڵەتمان پێ نەدەن خراپەیان لەگەڵ بکەینەوە، ئەوان وەختێ هەڵەی خۆیان دەکەن پەیوەندی بەخۆیان هەیەو سزای تاوانەکانیان وەردەگرنەوە لەدواڕۆژدا، نابێت بەهۆی ئەوانەوە ئێمەش خۆمان تووشی هەمان سزای چاوەڕوانکراو بکەین، واتە هەرگیز ڕێگەمان نیە بەخراپە ڕووبەڕووی خراپە ببینەوە.**

١٢. قِيلَ يا رسول الله ، ادعُ الله عَلى المُشركِينَ. قال:

« إِنّي لَم أُبعَث لَعَّاناً ، وَلَكِن بُعِثتُ رَحمَةً » (أدب المفرد)

**واتە: وترا ئەی پێغەمبەری خوا (سەلامی خودای لەسەربێت) دوعای تیاچوون بکە لەهاوبەش پەیداکەران، (لە وەلامیانا) فەرمووی: من نەنێردراوم بە نەفرینکار(لەخەلکی)، بەلکو بە ڕەحمەت نێردراوم (بۆ تەواوی مەخلووقات).**

## تێبینی //

**نەفرین (لەعنەت) بریتی یە لە بێبەش بوون لە ڕەحمەتی خودا.. نەفرینکار بریتی یە لەوکەسەی کەحەزدەکاو دوعا دەکات خەلکانێك لە سۆزو بەزەیی و میهرەبانیی خوا بێبەش بن و چارەنووسیان بە دوورخستنەوەیان لەبەهەشت و هۆگر کردنیان بەسزاو ئاگری دۆزەخ کۆتایی پێ بێت، ئەم ڕەوشتەش حاشا لەپێغەمبەری خۆشەویستمان بەدوورەو نابێ باوەڕدارانیش تێیاندا بێت..**

١٣. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِنَّمَا بُعِثْتُ لأُتَمِّمَ مَكَارِمَ الأَخْلاَقِ ». (سنن الكبرى،مسند شهاب)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی:**

**بێ گومان و زۆر بەدلنیاییەوە من بۆ ئەوە نێردراوم تا ڕەوشتە بەرز و بەڕێز و جوانەکان تەواو بکەم .**

١٤. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« بُعِثْتُ رَحْمَةً وَهَدًى لِلْعَالَمِينَ ». (المعجم الكبير)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت فەرمووی:**
**مـن نێـردراوم بەڕەحمـەت وهیدایـەت و ڕێنماییكـار بۆسـەرجەمی بوونەوەران..**

## تێبینی //

**ئـەم فـەرموودە لـەدڵا شـیرینە دوو ڕەوشـت وئـەركی پێغەمبـەرمان – سەلامی خودای لەسەر بێت – پێ دەناسێنێ:**
**یەكـەمیان: (ڕەحمـەت) كـە بـۆ هـەموو مەخلووقاتـە بەگـشتی لـەگرۆهی (مرۆڤ و فریـشتەو جنۆكـەو ئـاژەڵ و تەنانـەت دارو درەختـیش) چونكە چۆن ئـەرك و مافـەكانی بـۆ مرۆڤـەكان دەسـت نیـشان دەكـرد بەهـەمان شـێوەش مافـەكانی ئاژەڵانیـشی دیـاری دەكـرد لەسـەر خاوەنـەكانیان، هـەم لـە تێركردنیـان لـەخۆراك و ئـاو، هـەم لـە لێنـەدانیان و بـاری گـران نەخستنە سەرپشتیان، ئەوە جگە لەوەی كەفـەرمانی بەجـەنگاوەرانیش دەكرد دارو درەختی دوژمنانیشیان نەبڕنەوە..**
**دووەمیـان: (ڕێنیـشاندەر): كەخۆشەویـست –سـەلامی خـودای لەسـەر بێت –یەكپارچـە هیدایـەت و ڕێنومایيـە بۆگرۆهی(ئـادەمیزاد وجنۆكـە) بۆخـستنەسەر ڕێگـای هیدایـەتی ئیلاهـی وبەختـەوەربوونیان لـەدونیاو دواڕۆژدا.**

١٥. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِنَّ مِنْ أَبَرِّ الْبِرِّ صِلَةَ الرَّجُلِ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ بَعْدَ أَنْ يُوَلِّيَ » (مسلم)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:**

**بێگومان یەکێك لەچاکترینی چاکان ئەوەیە کەمرۆڤ هاموشۆی خۆشەویستانی باوکی بکات وبەسەریانکاتەوە(لەدوای مردنی باوکی)**

**نموونە//**

**جارێکیان(عەبدوڵای کوڕی ئیمامی عومەر) لەگەڵ چەند هاوەڵێکی بەڕێگادا دەڕۆیشت، چاوی بەپیاوێکی پیری دەشتەکی کەوت و لێی پرسی تۆ فولانی کوڕی فولان نیت؟ پیاوە پیرەکە گوتی بەڵێ هەوم، عەبدوڵا گوێ درێژەکەی خۆی پێ بەخشی وگوتی فەرموو بۆخۆت سواری پشتی بە، مێزەرەکەی سەری خۆیشی داکەندو وتی فەرموو ئەوەش سەری خۆتی پێ ببەستە، ئەوانەی لەگەڵی بوون وتیان ئەم پیرە پیاوە کێ بوو ئاوا پێشوازیت لێکردو ئەو هەموو دیارییەشت پێ بەخشی لەکاتێکا تۆ تەنها ئەم ئاژەڵەت هەبوو هاموشۆت پێ دەکردو، ئەو مێزەرەش سەری خۆت پێ دەبەستا؟!، وتی ئاخر من لەپێغەمبەری خوام بیستووە دەیفەرموو: بەڕاستی لەچاکترینی چاکان: بەسەر کردنەوەو هاموشۆکردنی خۆشەویستانی باوکتە لەدوای مردنی، ئەوە برادەری{عومەری باوکم}بوو بۆیە وام لەگەڵیدا کرد.**

١٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مِنْ حُسْنِ إِسْلامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لا يَعْنِيهِ » (مسلم)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرمویٚ:**

**لەچاك پابەندبوون و موسڵمانێتی هەركەسێكە كە واز لەوشتانە دێنیٚ پەیوەندییان بەوەوە نییەو شایان و مایەی گرنگی پێدانی ئەو نین.**

١٧. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« المُؤمِنونَ: هَيِّنونَ لَيِّنونَ مِثل الجَمَلِ الأنِف، إن قِدتَهُ انقادَ، وَإن أَنخِتَهُ عَلى صَخرَةٍ استَناخَ » (شعب الايمان)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرمویٚ:**

**بـاوەڕداران ئەوانـەن كـە هـێمن و لەسـەرەخۆو نـەرم و نیـانن، لـەجوانی هەڵسوكەوت لەگەڵكردنیانا وەكو وشتری گوێڕایـەڵ و بەرفـەرمانن، ئەگـەر بتـەویٚ بیڕوێنـی دەڕوات و بەقسەت دەكـات، وەئەگـەر پاڵیكـەوێنی لەسـەر بەردێكی ڕەقیشا بێت پاڵدەكەویٚ و بەقسەت دەكات.**

**تێبینـی // ئـەم فەرموودەیـە شـەرحی ئـەم بەشـە ئایەتـەی خـودا دەكـات لەهەڵسوكەوت و مامەڵـەی ئیمانـداران لەگـەڵ یـەكترا كەدەفـەرمویٚ: { أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ } واتـە ئیمانداران ناسك و دڵنەرم و دەستبەستراو و گوێڕایـەڵ و بەرفـەرمان و زەلـیلن لەگـەڵ یـەك و لـەناو خۆیانـدا، بـەواتا ئیمانـدار چـۆنی چاوەڕوان لیٚ بكـەی ئاوهایـەو نـسبەت بـەبرای ئیمانـداری ڕەتكردنەوەی لەهیچ شتێكی تەندروستا نیە.**

١٨ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« أَرْبَعٌ إِذَا كُنَّ فِيكَ فَلَا عَلَيْكَ مَا فَاتَكَ مِنْ الدُّنْيَا: حِفْظُ أَمَانَةٍ، وَصِدْقُ حَدِيثٍ، وَحُسْنُ خَلِيقَةٍ، وَعِفَّةٌ فِي طُعْمَةٍ » (مسند احمد)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خوای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**چوارشت ئەگەر تێتدا هەبوو ئیدی گوێ بەهیچ شتێك مەدە كە لەدونیادا لەدەستت بچێ ، یان بێ بەشی لێی:**

**١- پاراستنی ئەمانەت.**

**٢- راستگۆیی لە قسەدا.**

**٣- باشی و جوانی لەڕەوشت و لە ڕووالەت دا.**

**٤- پاکی و حەلاڵی لە قووت و خۆراکدا.**

١٩ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ » (سنن الترمذي)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:**

**لە خوا بترسەو پارێزکاری بکە لە هەرکوێ و لەهەر بارودۆخێکا بوویت، لە دوای هەرخراپەیەك چاکەیەك بکە خراپەکە دەسڕێتەوە، لەگەڵ خەڵکیش بەڕەوشتی جوان مامەڵەو هەڵس وکەوت بکە.**

٢٠. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ إِذَا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَهُ » (صحيح جامع الصغير)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**بێ گومان و زۆر بەدڵنیاییەوە خودای گەورە پێی خۆشە ئەگەر یەکێك لەئێوە کارێکی کرد بە ئەوپەڕی وردەکاریی و سەلیقەو دڵسۆزی و دڵ لەسەر دامەزرانەوە بیکات.**

٢١. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ الصَّابِرُ فِيهِمْ عَلَى دِينِهِ كَالْقَابِضِ عَلَى الْجَمْرِ ».

(سنن الترمذي)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**کات و سەردەمێك بەسەر خەڵکان دادێت: خۆڕاگرو ئارامگر لەسەر ئایینەکەی تیایاندا وەکو کەسێکە کە پشکۆو پۆڵووی ئاگری بەدەستەکانی گرتبێت.**

٢٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« أَفضَلُ الإِيمانِ الصَّبرُ وَ السَّماحَة ». (شعب الإيمان)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**باشترین باوەڕ و باوەڕداریی کردن بریتیە لە: ئارامگرتن و سینەفراوانی و لێبوردەیی بەدڵ و دەروون.**

٢٣. « سُئِلَ رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ عَنْ أَفْضَلِ الإِيمَان؟
قَالَ:أَفْضَلُ الإِيمَانِ أَنْ تُحبَّ لِلَّه،وَتُبْغِضَ لِلَّه،وَتُعْملَ لِسَانَكَ فِي ذِكْرِ اللَّه،قَالَ:وَمَاذَا يَارَسُولَ اللَّه؟
قَالَ:وَأَنْ تُحبَّ للنَّاسِ مَا تُحبُّ لنَفْسكَ، وَتَكْرَهَ لَهُمْ مَا تَكْرَهُ لنَفْسكَ،وَأَنْ تَقُولَ خَيْرًا أَوْ تَصْمُتَ» (معجم الكبير للطبراني)

واتە: پرسیارکرا لەپێغەمبەری خوا سەلامی خودای لەسەربێت: لەباشترین باوەڕو باوەڕداریی کردن، فەرمووی باشترین باوەڕو باوەڕداریی کردن ئەوەیە کە خۆشەویستیت لەبەرخوداو تووڕەبوونیشت هەر لەبەرخوا بێ، زمانیشت هەمیشە بۆیادی خوا لە کارا بێت (وەك زیکری خواو ئامۆژگاری کردنی خەڵك و بانگەوازیکردن بۆ ئیمان و ئیسلامەتی و...هتد)، خاوەن پرسیار وتی چیتر ئەی پێغەمبەری خوا؟

خۆشەویست سەلامی خوای لەسەر بێت فەرمووی:
چیت بۆخۆت پێخۆشە بۆخەڵکانیشت پێخۆشبێ و هەرچیت بۆخۆت پێناخۆشە بۆ ئەوانیشت پێناخۆشبێت، هەمیشەش یان بەخێرو چاکە بدوێی یان بێدەنگ بیت.

٢٤. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:

« أَلاَ كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّته،فَالأَميرُالَّذى عَلَى النَّاسِ رَاعٍ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّته،وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْته وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالْمَرْأَةُ رَاعيَةٌ عَلَى بَيْت بَعْلهَا وَوَلَده وَهيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُمْ،وَالْعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَال سَيِّده وَهُوَمَسْئُولٌ عَنْهُ،أَلاَ فَكُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّته » (مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

ئێوە هەمووتان شوان و چاودێرن بەسەرخەڵکانەوەو هەریەکێکیش لە ئێوە لێپرسراوە لەوانەی وا لەژێر دەست و فەرمان و چاودێری ئەودان، سەرۆك و فەرماندە کەسەرپەرشتی خەڵکان دەکات شوان و چاودێرەو بەرپرسیشە لەوکۆمەڵ و گەل و نەتەوەو خەڵکانەی وا لەژێر فەرمان و چاودیری ئەودان، پیاو شوان و چاودێرە بەسەر خانەوادەکەی و لێپرسراویشە لەسەریان، ئافرەت شوان و چاودێرە بەسەر ماڵ و منداڵی پیاوەکەی خۆی و لێپرسراویشە لەسەریان، خزمەتگوزار شوان و چاودێرە بەسەر سەروەت و سامانی خاوەنەکەی و بەرپرسیشە لەسەریا، بزانن کە هەمووتان شوان و چاودێرن و هەمووشتان بەرپرسن لەوانەی وا خراوەتە ژێردەست و فەرمان وچاودێریتانەوە.

٢٥. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى أَجْسَادِكُمْ وَلاَ إِلَى صُوَرِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ ». وَأَشَارَ بِأَصَابِعِهِ إِلَى صَدْرِهِ » (مسلم)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرمویٚ:**

**بەڕاستی خودا تەماشای جەستەو شێوەو ڕووخسارتان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵەکانتان دەکات( خۆشەویست بەپەنجە پیرۆزەکانی ئاماژەی بۆسینەی موبارەکی کرد).**

**مەبەست//**

**لەوەیە کەخودا تەماشای بچووکی و گەورەیی، یان ڕەشێتی و سپێتی جەستەو ڕووخسارەکان ناکات، وەك چۆن تەماشای زمانی جیاوازو گەل و نەتەوەی جیاوازیش ناکات، بەڵکو تەماشای دڵی گەرم و گەش و پەیوەست بەخودا دەکات کە شوێنگەی ئیمان و تەقوایە و تەنها ئەویشە مایەو هۆکاری ڕێزداربوونی مرۆڤ لەلای خودا:**

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)
(الحجرات ١٣).

٢٦. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَا مِنْ قَوْمٍ يُعْمَلُ فِيهِمْ بِالْمَعَاصِي يَقْدِرُونَ عَلَى أَنْ يُغَيِّرُوا فَلاَ يُغَيِّرُوا إِلاَّ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ مِنْهُ بِعِقَابٍ ».

(سنن الكبرى للبيهقي)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**هیچ گەل و نەتەوەیەك نییە گوناه و تاوان و خراپەكاری لەناویاندا ئەنجام بدرێت و لەتواناشیاندا بێت بیگۆڕن و نەیگۆڕن ئەوا نزیكە كەتۆڵەو سزای خوا بەگشتی بۆیان دابارێ و هەموویان بگرێتەوە.**

**نموونە//**

**دابارینی سزای گشتی و تیاچوونی گەل و نەتەوەیەك بەتێكڕایی وەك یاسایەكی ئیلاهی لەگەل و نەتەوەو سەردەمانی پێشوو وجوودی هەبووەو هەركاتێك هۆزو گەلێك وەلامی پێغەمبەرەكەی خۆیان نەدابێتەوەو هەموو سنوورەكانی خوایان بەزاندبێت و ستەمیان لەخۆیان بەتایبەتی و لەخەڵكی بەگشتی لەسەری ڕژابێت و ئیمان و ئەخلاق و فیترەت و ویژدان و ئینسانەتیان ژێرپێ خستبێ ئەوا دوای چەندین جار ئاگاداركردنەوەو بەهانە بڕین خودا بەیەكێك لەسزا بەتینەكانی خۆی لەناوی بردوون و تۆڵەی لێ سەندوونەتەوە، بۆ یەكێك لەو هۆزو گەلانەی كەبڕیاری سزای گشتی و تیاچوونی تێكڕاییان بۆ دەرچوو بوو فریشتەكانی خوا بینیان كەسێك یان**

کۆمەڵەکەسێك لەوان خەریکی خواپەرستی و ئەنجامدانی پەرستشەکانن، گەڕانەوە لای خوداو وتیان خوایەگیان فەرمانت لەسەر سەرەو جێبەجێکراوە وەلیّ خەڵکانێك لەناو ئەواندا خەریکی بەندایەتی و پەرستنی تۆن، چی لەوان بکەین؟
لە وەڵامیانا خودا فەرمووی سزاکە گشتی یەو بۆئەوانیش دابەزیوە، چونکە ئەوانیش ئەو هەموو گوناه و تاوان و ستەم و خراپەیان دەدیت ڕۆژێك قسەیەکیان نەکردو خەڵکەکەیان ئامۆژگاری نەکردو نەیان ترساندن بەسزاو ئاگری دۆزەخ و تیاچوونی گشتی لەلایەن خوداوە..
تێبینی//
ئەم خوا پەرستانە ئەگەرچی بەبەر سزای گشتی و تیاچوونی تێکڕایی کەوتن، بەلاّم بۆ دواڕۆژ سەلامەتن و خودا بەندایەتی و خواپەرستییەکانیان بەزایە نادات و لێیان خۆشدەبێت و دەیانباتە بەهەشتیشەوە إن شاء الله، وەلیّ بۆ پەند لێوەرگرتن و ترساندنی زانایان و خواپەرستانی دوای خۆیانە کەهەڵسن بەئەرکی ڕاستەقینەی سەرشانیان کەفەرمان کردنی دڵسۆزانەیانە بەچاکەو ڕێگیری کردنی حەکیمانەیانە لەخراپە لەهەموو کات وشوێنێك.

٢٧. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يَكُونَ هَوَاهُ تَبَعًا لِمَا جِئْتُ بِهِ »

(الترمذي ، البغوي ، النووي في الأربعين)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

هیچ یەکێك لە ئێوە ئیمانی تەواو و پڕ نابێت هەتاوەکو حەزو ویست و ئاوات و ئارەزوو و خۆزگەو خولیاکانی شوێنکەوتەو هاوشانی ئەو بەرنامەو شەریعەتە نەبێت کە من هێناومە.

بەواتا: دەبێت بە جۆرێك ئیش لەسەر دڵ و دەروون و هەست و نەست و هۆش و خەیاڵی بکات و گەشەو نەشونمایان پێبکات کە بەهەمیشەو لەهەموو کات و بارودۆخێکا حەزو ویست و خۆزگەو خولیاو ئاوات و ئارەزووەکانی بەتەنها بەیاساو ڕێساو فەرمان و فەرمایشتەکانی پەیامی خواو ئایین و شەریعەت خۆشحاڵ و گەشاوەو ئاسوودەمەند بن

٢٨. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِنَّ أَبْغَضَ الرِّجَالِ إِلَى اللَّهِ الأَلَدُّ الْخَصِمُ » (مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

ناحەزترینی خەڵکان بەلای خوداوە ئەوانەن: کە ڕق ئەستوورو مشتومڕکاری قین لە دڵ و سەرسەختن لە دوژمنایەتی کردنا.

٢٩. قيل يا رسول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« أي العباد أحب إلى الله؟ قال: أنفع الناس للناس ، قيل: فأي العمل أفضل؟ قال: إدخال السرور على قلب المؤمن، قيل: وما سرور المؤمن؟ قال: إشباع جوعته، وتنفيس كربته، وقضاء دينه، ومن مشى مع أخيه في حاجته كان كصيام شهر واعتكافه، ومن مشى مع مظلوم يعينه ثبت الله قدميه يوم تزل الأقدام، ومن كف غضبه ستر الله عورته، وإن الخلق السيء يفسد الأعمال كما يفسد الخل العسل »

(حلية الاولياء)

واتە: بەپێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەربێت) وترا: كام لە بەندەكان خۆشەویستترینیانە بەلای خوداوە؟

فەرمووی: سوودمەندترینی خەڵكان بۆ خەڵكان، پاشان لێیان پرسی ئەی كام كردەوە چاكترینی كردەوانە؟

فەرمووی: خۆشی خستنە دڵی مرۆڤی ئیماندارەوە، وتیان دڵخۆشكردنی ئیماندار چیەو چۆنە؟

فەرمووی: تێركردنی برسیەتیەكەی ، لابردنی خەم و گرفتارییەكانی و هەناسە پێبەخشینەوەی ، قەرز لەجیاتی دانەوەی، هەركەس بەدەم داوای براكەیەوە بڕوات و پێویستییەكەی جێ بەجێ بكات وەكو بەڕۆژووبوونی مانگێك و خەڵوەتكێشان و دەرنەچوون و خۆهێشتنەوەی مانگێك وایە لەمزگەوتدا ، وەهەركەس لەگەڵ

ستەملێكراوو ماف خوراوێك بڕوات و پشتگیری بكات بۆ لابردنی ستەمەكەی و دەستخستنەوەی مافەكانی ئەوا خودا قاچەكانی دامەزراو دەكات لەو ڕۆژەی كە قاچەكان دەلەرزن و دەخلیسكێن (واتە لەكاتێكا كە نەفس و شەیتان ڕووبەڕووی دەبنەوەو دەیانەوێ قاچەكانی بخلیسكێننە ناو گوناە و تاوان خودا قاچەكانی دامەزراو دەكات و ناهێلێ بەسەریدا زاڵبن ، لەكاتێكیش ڕووبەڕووی هێزو دەسەلات و لەشكری ستەمكارو ناموسڵمانان دەبێتەوە خودا قاچەكانی دامەزراو دەكات و پشت هەڵناكات و لەحەق خۆی بێ بەری ناكات، هەروەها لەڕۆژی دوایشداو لەحەشرو حیسابا قاچەكانی دامەزراو دەكات وترس و خەمناكی لەدڵی دەڕەوێنێتەوەو لێی خۆش دەبێت و بەبەهەشتی شادومان دەكات)، وەهەركەس تووڕەیی خۆی بخواتەوە خودا عەیب وعارەكانی دادەپۆشێ، وە بەڕاستی و بەدڵنیاییەوە ڕەوشتی خراپ و ناشیرین كردەوەكانی مرۆڤ و عیبادەتەكانی دەشێوێنێ وبەسەریەكدا دەیان ڕمێنێ وفاسیدیان دەكات وەك چۆن خەل (لەتێكەڵكردنیا) هەنگوین دەشێوێنی وتێكی دەدات.

٣٠. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« خَيْرُ النَّاسِ: ذُو القَلْبِ المَحْمومِ واللِّسانِ الصَّادِق، قِيلَ: مَا القَلْبُ المَحْمُومُ؟ قالَ هُوَ التَّقيُّ النَّقيُّ الَّذي لا إِثْمَ فِيهِ ولا بَغْيَ ولا حَسَدَ، قِيلَ فَمَنْ على أثَرِه؟ قالَ الَّذي يَشْنأُ الدُّنْيا وَيُحِبُّ الآخِرَةَ، قِيلَ فَمَنْ على أثَرِه؟ قالَ مُؤمِنٌ في خُلُقٍ حَسَن » (الطبراني وأبو نعيم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرمویٚ:
چاکترینی خەڵکان ئەوەیانە کە خاوەن دڵێکی پڕ لەکوڵی گەرم وگەش و خاوەن زمانێکی ڕاستی بێژە، وتیان دڵی پڕ لەکوڵی گەرم و گەش چییەو چۆنە؟ فەرمووی: دڵێکە لەخواترس و خۆپاریزو هەڵبژاردەو پاك و پاڵفتەیە، نەگوناه و تاوانی تێدایەو، نەستەم و لەسنوور دەرچوون و، نەئیرەیی و حەسادەتیش، وتیان بەڵگەو نیشانەی چییەو کیٚ شوێن پێهەڵگرو لەسەر شوێنەواری ئەو دڵەیەو هەنگاوەکانی بەرەو بەخاوەن بوونی ئەو دڵەیە؟ فەرمووی: ئەوکەسەی ڕقی لەدونیایەو دژایەتی دەکات و لەبەرامبەریشدا حەزو خۆشەویستی بۆ دواڕۆژ هەیەو کاری بۆ دەکات، وتیان ئەی کیٚ شوێن پیٚ هەڵگرو لەسەر ڕیٚ و شوێنەواری ئەوکەسەیە (کە ڕقی لە دونیایەو دژایەتی دەکات و لەبەرامبەریشدا حەزو خۆشەویستی بۆ دواڕۆژهەیەو کاریشی بۆدەکات؟) فەرمووی: ئیماندارێك کە لەسەر ڕەوشتی جوانە.

٣١. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« ثلاثٌ منْجياتٌ خَشْيَةُ الله تعالى في السِّرِّ والعَلاَنِيَة والعَدْلُ في الرِّضا والغَضَبِ والقَصْدُ في الفَقْرِ والغِنَى وثلاثٌ مُهْلكاتٌ هَوًى مُتَّبَعٌ وَشُحٌّ مُطاعٌ واعْجابُ المَرءِ بنَفْسه ». (كنز العمال)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

سێ شت رزگارکەرن و هۆکاری رزگاربوونن بۆ مرۆڤ:

١- ترسان لە خودای بەرزو بالاَّ لەنهێنی وئاشکراییدا.

٢- دادپەروەری و میانەڕەوی لە ڕەزامەندی و لە توڕەییدا.

٣- خۆگرتنەوەو بەرنامە ڕێژیی لەخەرجکردنی پارەو سەروەت و ساماندا لەکاتی هەژاری و دەوڵەمەندیدا.

وە سێ شتیش تیابەرو هۆکاری تیاچوونی مرۆڤن:

١- هەواو ئارەزوو و هەوەسبازییەکی ناتەندروست کە مرۆڤ شوێنی بکەوێت.

٢- ڕەزیلی وچرووکی و ڕژدییەك کە گوێرایەڵی وبەرفەرمانی بۆبکرێت.

٣- هەروەها سەرسام بوونی مرۆڤ بەخۆی (بەواتا سەرسام بوونی مرۆڤ بەجوانی و دەوڵەمەندی و هێزو دەسەلاَّت و بەهرەو زانست و ژیری و پلەوپایەی کۆمەلاَّیەتی و ڕشتەو بنەچەی باو باپیران و... هتد..).

٣٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا وَإِنْ كَذَبَا وَكَتَمَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا » (البخاري)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
کڕیارو فرۆشیار (یان ئەو دووانەی شت دەگۆڕنەوە لەنێوانی خۆیانا) هەردووکیان ئارەزوومەندو ئازادن لەفرۆشتن یان کڕین یان پەشیمان بوونەوە لەگۆڕینەوەی کاڵاکەیان هەتاوەکو لێك جودا نەبووبنەوە، ئەگەر ڕاستیان کرد لەگەڵ یەك و بەئاشکرایی و بێ پێچ و پەنا و بێ شاردنەوەی عەیب و ناتەواوییەکان کڕین و فرۆشتن و گۆڕینەوەکەیان ئەنجامدا ئەوا خودا بەرەکەت دەخاتە ناو کڕین و فرۆشتنەکەیانەوە، خۆئەگەر درۆیان لەگەڵ یەك کردو عەیب و ناتەواوییەکانیان لێکتر شاردەوە ئەوا خودا بەرەکەت هەڵدەگرێ لەمامەڵەکەیاندا.

٣٣. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« إِنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا وَلِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا وَلِأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ » (البخاري)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
بەڕاستی خودا مافی تایبەتی هەیە بەسەرتەوە، دەروون و جەستەو لاشەت مافیان هەیە بەسەرتەوە، خێزان و خانەوادەت مافیان هەیە بەسەرتەوە، کەوابوو هەر خاوەن مافێك مافەکەی خۆی پێ بدە.

٣٤. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ وَاحِدَةٌ مِنْ ثَلاثٍ فَلا يَحْتَسِبُ بِشَيْءٍ، تَقْوَى يَحْجِزُهُ عَنِ الْمَحَارِمِ، أَوْ حِلْمٌ يَكُفُّ بِهِ عَنِ السَّفِيهِ، أَوْ خُلُقٌ يَعِيشُ بِهِ فِي النَّاسِ»

(المعجم الكبير للطبراني)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**ئەوەی یەکێك لەم سێیانەی لەلا نەبوو با بەهیچی حیساب نەکات ئەو شتانەی تر کە لەلاینە:**

**١- لەخوا ترسانێك کە پارێزگاری لێبکات و کۆت و بەربەستبێ لە ئەنجامدانی ئەو شتانەی خودا قەدەغەی لێکردوون.**

**٢- یان نەرم و نیانی و خۆڕاگریی و دانبەخۆداگرتن و ژیریی و پەلەنەکردن و سینەفراوانی و لێبوردەییەك کە سەرچاوەکەی لە دەروونەوە هەڵقولأبێت و لەدڵ دا ڕەگ و ڕیشاڵی داچەقاندبێ تا بەهانایەوە بێت و هاوکاری بێت و بیپارێزێت لەمرۆڤی نالەبارو هەڵسوکەوتە نابەجێکانی.**

**٣- یان ڕەوشتێکی جوان و شایستەی وەها کە بتوانێ بەهۆیەوە بەخۆشی وسەلامەتی و دڵارامییەوە بژیێت لەناو خەڵکیدا ،**

**بەواتا (٣) سێ خەسڵەت قەڵغانن بۆ مرۆڤ ، ( لەخواترسانێك بیپارێزێ لە گوناه ، نەرم و نیانییەك لە مرۆڤی نالەباری بپارێزێت ، هەروەها ڕەوشتێکی بەرزو جوان کەپێی بژیێت لەناو خەڵکیدا ).**

٣٥. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« يَا أَيُّهَا النَّاسُ عَلَيْكُمْ مِنَ الأَعْمَالِ مَا تُطِيقُونَ. فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا، وَإِنَّ أَحَبَّ الأَعْمَالِ إِلَى اللَّهِ مَا دُووِمَ عَلَيْهِ، وَإِنْ قَلَّ »
(السنن الكبرى للبيهقي)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
ئەی خەڵکینە: ئەوەندە کارو کردەوەو عیبادات ئەنجام بدەن کە لە توانای جەستەو دەرونتاندا هەیەو پەرۆشی و تامەزرۆیی دڵتان لەگەڵی دایە، چونکە بێ گومان و زۆر بەدڵنیاییەوە خودا هەرگیز لە پەرۆشی و ئیشتیاقی دیدارو موناجات و عیباداتی بەندەکانی ساردنابێت و بێزار نابێ ، ئێوەن ساردو بێ تاقەت دەبن ، بەڕاستی خۆشەویست ترین کردەوەو عیبادەت لە لای خودا ئەوەیانە کە خاوەنەکەی بەردەوامی لەسەری هەیە ، ئەگەر کەمیش بێت.

٣٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« كَفَى بِالْمَرْءِ كَذِبًا أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ » (مسلم)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
ئەوەندە بەسە بۆ مرۆڤ کە درۆی بەرکەوێ و درۆی بۆ بدرێتە پاڵ و سەرەنجام بەدرۆزن بکەوێتەوە بەهۆی ئەوەی هەرچ شت و ڕووداوێکی بەرگوێ بکەوێ بێ دڵنیابوون لە ڕاستێتی بیگێڕێتەوەو قسەو باسی دەربارە بکات.

٣٧. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:

« إِنَّ دَعْوَةَ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ مُسْتَجَابَةٌ لِأَخِيه بِظَهْرِ الْغَيْبِ عِنْدَ رَأْسِه مَلَكٌ مُوَكَّلٌ بِه كُلَّمَا دَعَا لِأَخِيه بِخَيْرٍ قَالَ آمِينَ وَلَكَ بِمِثْلٍ » (الادب المفرد)

**واته: خۆشەویست سەلامی خوای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**بەڕاستی و زۆر بەدڵنیاییەوە دوعای مرۆڤی موسڵمان بۆ براکەی لەتەنیایی و لەنادیاری ئەودا وەرگیراوو قبوڵکراوە لەلایەن خوداوە، لەلای سەریەوە مەلائیکەتێکی تەرخانکراوو ڕێپێدراوی خودا وەستاوەو هەرکاتێك دوعای بەخێری بۆ براکەی کرد دەفەرموێ (آمین) بۆتۆش بەهەمان شێوە.**

٣٨. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:

« دبَّ إِليكُم داءَ الأُمَمِ: الحَسَد وَالبَغضَاء ،هِيَ الحالقَة،لا أَقُولُ تَحلِقُ الشَّعَر، وَلكِن تَحلِق الدّين » (سنن الترمذي)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**هێندێ لە دەردو نەخۆشی میللەتان بۆ ئێوە گواستراوەتەوەو بەسنگەخشێ خۆی گەیاندۆتە گیانتان، ئەوانیش: ئیرەیی (حەسادەت) و ڕق و کینەن، بەڕاستی تراشەرن، نالێم قژو موو دەتراشن، بەڵکو دین و ئایین دەتراشن.**

٣٩. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِخِيَارِكُمْ قَالُوا بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ الَّذِينَ إِذَا رُءُوا ذُكِرَ اللَّهُ تَعَالَى ثُمَّ قَالَ أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِشِرَارِكُمْ الْمَشَّاءُونَ بِالنَّمِيمَةِ الْمُفْسِدُونَ بَيْنَ الْأَحِبَّةِ الْبَاغُونَ لِلْبُرَآءِ الْعَنَتَ » (مسند أحمد)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت فەرمووی:
ئایا هەواڵتان بدەمێ بەباشترین کەستان؟ وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(سەلامی خوای لەسەربێ)، فەرمووی: ئەوانەن کەهەرکات ببینرێن خودا بیردەکەوێتەوە (واتا هەر کات یەکێك لەم جۆرە کەسانە ببینی خودات بیردەکەوێتەوە)، پاشان وتی هەواڵتان بدەمێ بەخراپترینی کەسانتان؟ ئەوانەیانە کەقسەی نادروست و ناشایستە لەنێوان خەڵکی دێنن و دەبەن و، ئەوانەش کەنێوانی خۆشەویستان تێکدەدەن بەدرۆو بوختان وفیتنەو، هەروەها دەست درێژکارانێکیش کەخەڵکانی بێ گوناه ڕووبەڕووی تۆمەت و سەختی و تیاچوون دەکەنەوە.

مەبەست// لەوانەی کەبینینیان خوا بەبیر خەڵکان دەهێننەوە ئەوانەن کە زۆر بەگەرم و گەشیی دڵیان پەیوەستە بەخوداوەو ڕەوشت بەرزو ئاکار جوان و بەویقارو دڵارام و دەم بەزیکرن و بینینیان خودا بەبیر مرۆڤەکان دەهێنێتەوەو جۆش و خرۆش دەخەنە ناو دڵەکان و تەکانی بەرەو خواچوونیان پێ دەدەن.

٤٠. « عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ كُنْتُ خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا فَقَالَ يَا غُلَامُ إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ احْفَظْ اللَّهَ يَحْفَظْكَ، احْفَظْ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ، إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلْ اللَّهَ، وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ، وَاعْلَمْ أَنَّ الْأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَكَ، وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ، رُفِعَتْ الْأَقْلَامُ وَجَفَّتْ الصُّحُفُ » (سنن الترمذي)

واتە: لەئیبن وعەبباسەوە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لەسەربێ گێڕدراوەتەوە، گوتی: ڕۆژێکیان لەدواوەی پێغەمبەری خواوە بووم سەلامی خودای لەسەربێت، پێی وتم: ئەی گەنج گوێ بگرە تا من چەند وشەو ڕستەو باس و حەقیقەتێکت فێربکەم: خودا بپارێزە خوداش تۆ دەپارێزێت (بەواتا تۆ گەورەیی خوداو تەواوی دەسەڵاتەکانی و سەرجەمی ناوە جوانەکانی و ئەفعالە حیکمەت ئاوێتەکانی و شەریعەتەکەی و فەرمانەکانی لەدڵ و گیان و ئاکارو ڕەوشت و کردەوەتدا بپارێزەو ڕەنگیان پێبدەوە لەژیانی خۆتدا خودای گەورەش تۆ دەپارێزێ بەهەموو ماناکانی پاراستن، لەسەرووی هەمووشیانەوە پاراستن لەهێزو هێرش و دەسەڵاتەکانی نەفس و شەیتان بەسەرتداو هەروەها کەوتنە نێو داو و چاڵی هەڵگەڕانەوەو کوفر و نیفاق و تەواوی ئافات و ناخۆشی و نەخۆشیە دەروونی و دونیایی و دینییەکان)، خودا بپارێزە هەمیشە دەیبینی بەپیر

داواكانتەوە دێت و هاوكاريت دەكات، ئەگەر داواى هەرشتێكت كرد تەنها لەخوداى داوا بكە، ئەو دەمە دەستكەوتنى هەموو شتەكانت لەبەخشندەيى خودا دەزانى ئەگەرچى بەهۆكارو لەڕێى دروستكراوەكانيشەوە پێت بگات، وەئەگەر داواى كۆمەك و يارمەتيت كرد تەنها لەخوداى داوا بكە، ئەو دەمە كۆمەك و يارمەتيت بەهەر هۆكارو لەهەر مرۆڤ و دروستكراوێكەوە پێبگات هەر لەخوداى دەزانى، وە بشزانە ئەگەر هەموو ئوممەت وگەل وخەڵكان كۆببنەوە لەسەرئەوەى لەشتێكا سوودت پێبگەينن ئەوا ناتوانن مەگەر ئەو سوودەى كەخودا بۆى نوسيبى و بڕيارى بۆت دابێت، وەئەگەر هەموويان كۆببنەوە لەسەرئەوەى لەشتێكا زيانت پێبگەينن ئەوا هەمديسان ناتوانن مەگەر ئەو زيانەى كەخوا لەسەرتى نووسيبىٚ و بۆى بڕياردابيت، ئيدى بۆ كارنامەى مرۆڤەكان قەڵەمەكان هەڵگيراون و بەرزكراوەنەتەوەو دەفتەرو لاپەڕەكانيش وشك بوونەتەوە.

٤١. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ ». (مسلم)

واتە: خۆشەويست سەلامى خوداى لەسەربێت دەفەرمویٚ:

ئەگەر خودا خێرى بۆكەسێك بوێت ئەوا شارەزاى وردو ڕاستەقينەى دەكات لە ئايين و بەرنامەكەى خۆى.

**تێبینی //**

شارەزابوونی ورد و ڕاستەقینە لە ئایین و بەرنامەی خوا بریتیە لە تێگەیشتن و حاڵی بوونی ئەصلی مەطالیبە ئیلاهییەکان و دەست و دڵ گرتن بە ڕۆح و ناواخن وگەوهەری پەیامەکان و جێنشین کردنیان لە دڵ ودەروونداو پاشان ڕەنگدانەوەیان لە ئاکارو ڕەوشت وکردەوەدا لەلوتکەی ئاستەکانیان و گەیاندنەوەو بانگەواز بۆکردنی ئەوپەیامە ئیلاهییانەش بەجوانترین شێوە هەم بەحیکمەت ودانایی و هەم بەئامۆژگاری دروست و جوان.

٤٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« عَجَبًا لأَمْرِ الْمُؤْمِنِ إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ وَلَيْسَ ذَاكَ لأَحَد إِلاَّ لِلْمُؤْمِنِ،إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ »

(مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

بەڕاستی کاروبارەکانی باوەڕدار مایەی سەرسوڕمان و سەرسامییە، چونکە بێ گومان و بەدڵنیاییەوە کاروبارەکانی هەمووی چاك و خێرە، ئا ئەو چاکی وخێرەش بۆهیچ کەس نیە جگە لەمرۆڤی بڕوادارنەبێ، ئەگەر خۆشی و مژدە و شتانێکی دڵگیری بۆ پێش هات و سوپاسگوزاری خودای کرد لەسەریان ئەوا بەچاکەو خێر بۆی تەواودەبێ و بۆی دەنووسرێت، ئەگەر نەخۆشی و ناخۆشی و نەهامەتیشی تووش هات و ئارامی لەسەر گرت ئەوا ئەویش بەچاکەو خێر بۆی تەواو دەبێت و دەنووسرێت.

٤٣. قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِنَّ شَرَّ النَّاسِ عِنْدَ اللَّهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ شَرِّهِ ».

(البخاري)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

بێگومان، لەڕۆژی دواییدا خراپترینی خەڵکان لە پلەوپایەو شوێن و جێ دا لەلای خودا ئەو کەسەیانە کەخەڵکی لێی دووردەکەونەوەو خۆپارێزیی لێ دەکەن لەترسی خراپەو بەڵاو گێچەڵ و نەهامەتی و دەردیسەری و خراپەکاری دەست و زمانی.

٤٤. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« لاَ يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ فَإِنْ كَانَ لاَ بُدَّ مُتَمَنِّيًا فَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتالْوَفَاةُ خَيْرًا لِي ».

(مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

باهیچ یەکێك لە ئێوە داوای مردن نەکات و ئومێدی بۆ نەخوازێت لەبەر ئازارو زیانێك کە بۆی دابەزیوە، خۆ ئەگەر هیچ چارەیەکی نەبوو هەر دەبوایە داوای کردبایەو ئومێدی بۆ بخواستبایە ئەوا با بڵێت: ئەی خودایە بمژیێنە هەتا ئەو کاتەی ژیان بۆمن باشترو خێرترە، وە بم مرێنە ئەگەر مردن بۆمن باشترو خێرترە.

٤٥. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِنَّ اللَّهَ إِذَا أَحَبَّ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ فَقَالَ إِنِّى أُحِبُّ فُلاَنًا فَأَحِبَّهُ – قَالَ – فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ ثُمَّ يُنَادِى فِى السَّمَاءِ فَيَقُولُ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلاَنًا فَأَحِبُّوهُ. فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ،قَالَ ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِى الأَرْضِ. وَإِذَا أَبْغَضَ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ فَيَقُولُ إِنِّى أُبْغِضُ فُلاَنًا فَأَبْغِضْهُ، قَالَ: فَيُبْغِضُهُ جِبْرِيلُ ثُمَّ يُنَادِى فِى أَهْلِ السَّمَاءِ إِنَّ اللَّهَ يُبْغِضُ فُلاَنًا فَأَبْغِضُوهُ، قَالَ:فَيُبْغِضُونَهُ ثُمَّ تُوضَعُ لَهُ الْبَغْضَاءُ فِى الأَرْضِ ». (مسلم)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**خودای گەورە ئەگەر بەندەیەکی خۆشویست بانگی جبریل (سەلامی خودای لەسەربێت) دەکات و پێی دەفەرموێ: من فلانە بەندەی خۆمم خۆش دەوێت و تۆش خۆشت بوێت ، جبریلیش خۆشی دەوێت، پاشان جبریل لە ئاسماندا بانگ ڕادەدێرێ و دەفەرموێ: خودای گەورە فلانە بەندەی خۆش دەوێت و ئێوەش خۆشتان بوێ ، ئیتر کۆمەڵی مەلائیکەتانی ئاسمانیش خۆشیان دەوێ ، پاشان پەسەندبوونی لەسەر زەوی بۆ دادەندرێ و لای هەموو خەڵکانی سەر زەوی پەسەند دەبێ ، وە ئەگەر ڕقی لە بەندەیەکیش ببێتەوە ئیتر بانگی جبریل (سەلامی خودای لەسەربێت) دەکات و پێی دەفەرموێ: من ڕقم لە فلانە بەندەم دەبێتەوەو تۆش ڕقت لێی ببێتەوە، ئیدی جبریلیش ڕقی لێی دەبێتەوەو لە ئاسمانیش بانگ ڕادەدێرێ و دەفەرموێ: خودای گەورە**

ڕقی لە فلانە بەندەی دەبێتەوە و ئێوەش ڕقتان لێی ببێتەوە ، ئیتر سەرجەمی مەلائیکەتانی ئاسمانیش ڕقیان لێی دەبێتەوە ، پاشان ناپەسەند بوونی دەخرێتە سەر زەوی و لای خەڵکیش ناپەسەندو بێزراو و ناحەز دەبێت.

**تێبینی //**

خۆشەویست بوونی مرۆڤ لەلایەن خوداوە لەبەر ئیمانی گەش و گەرم و ئاکارو ئەخلاقییاتی بەرزو پەسندیەتی و ڕق لێ بوون و ناحەزبوونیشی لەبەر دوورکەوتنەوە لەئیمان و ئاکاری پەسەند و خووڕەوشتە جوانە ئینسانییەکانیەتی.

٤٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِيَّاكُمْ وَالْغُلُوَّ فِي الدِّينِ فَإِنَّهُ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ » (سنن إبن ماجة)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

ئەی خەڵکینە زۆر وریای زیادەڕەوی کردن بن لەدین و ئاییندارییدا، چونکە بێگومان و بەدڵنیاییەوە گەلەکانی پێش ئێوە بەزیادەڕەوی کردن لەدین و ئاییندارییاندا بەهیلاك چوون.

٤٧. عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ سَبَقَتْ رَحْمَتِي غَضَبِي ». (مسلم)

**واتە: لەخۆشەویستمانەوە سەلامی خودای لەسەربێت، ئەویش لەخودای بەرزو شکۆمەندەوە، خودا دەفەرمویٚ: سۆزو بەزەیی ومهرەبانیم بەپێش خەشم وقین و توڕەییم کەوتووە.**

**تێبینی // ئەم فەرموودە قودسییە کەخۆشەویستمان لەخوداوە بۆمان دەگێڕێتەوە پەیامێکی زۆر شیرینەو بۆئەوەیە ئێمەش تەکان بەدڵ و گیانی خۆمان بدەین و هەوڵ بدەین وەك ئەم ئاکارە بەرزو بەڕێزو پیرۆزو شیرینەی خواگیانە دڵ ودەروونمان ڕابهێنین و وەهاش ڕەفتاربکەین لەژیانی خۆماندا، ئەم پەیامە شیرینە پەیوەندی بەکۆمەڵێك پەیامی ترەوە هەیەو بەهەموویان هەم پێناسی یەکتر ڕۆشن دەکەنەوەو هەمیش یەکتر تەواو دەکەن، بەنموونە پەیامی: (يَسِّرُوا وَلَا تُعَسِّرُوا، وَبَشِّرُوا وَلَا تُنَفِّرُوا) و دەیان پەیامی تر، بەواتە باوەڕدار دەبیٚ هەمیشە لێبووردنی بە پێش تۆڵەکردنەوەی بکەوێت، گومان باشیی بەپێش بەدگومانیی بکەوێت، بەڕاست زانینی بەرامبەرەکانی بەپێش بەدرۆخستنەوەیان بکەوێت، بەسۆزی و مهرەبانیشی بەپێش تووڕەبوونی بکەوێت، بەکورتی تەواوی پەیامە نەرم وئاسان و ڕۆشنەکان بەپێش حاڵەتە توندو گران و ناڕۆشنەکان بخات لەژیانی دونیا وپەیڕەویکردنی دینیدا.**

٤٨. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« وَلَوْ كَانَتْ تَكُونُ قُلُوبُكُمْ كَمَا تَكُونُ عِنْدَ الذِّكْرِ لَصَافَحَتْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تُسَلِّمَ عَلَيْكُمْ فِي الطُّرُقِ » (مسلم)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرمویٚ:**

**ئەگەر بەردەوام دڵەکانتان وەکو حاڵی زیکرو زایکربوونتان بوایە ئەوا مەلائیکەتان تەوقەیان لەگەڵ دەکردن و هەتا لەسەر ڕێگاکانیش سەلامیان لێدەکردن.**

## تێبینی //

**ئەم فەرموودەیە باسی گەورەیی و گرنگی و بایەخی زیکرو بەرهەمەکەیمان بۆدەکات، کە هاوڕێیەتی کردنی مەلائیکەتان و تەوقەو سەلام لێکردنیانە لە دونیادا، بۆیە دەبێ پێناسەی زیکر بەهەمەچەشن بکرێت وبناسریٚ کە بریتی یە لە زیکری چاوەکان و زیکری گوێچکەکان و زیکری زمان و زیکری هۆش و عەقل و خەیاڵ و زیکری دڵ و زیکری جەستەو کردەوە بە گشتی، زیکری چاوەکان بریتی یە لەتێڕامانی قووڵ لەسەرجەم دروستکراوەکانی خوا، زیکری گوێچکەکان بریتییە لەگوێگرتن لە حەق و لەقورئان و لەفەرموودەو هەموو شتێکی باشی تریش کەهۆکارو هاوکارن بۆیادخستنەوەی خودا و شیرین کردنیان لەلای مرۆڤ ، زیکری زمان بریتی یە لە ژماردنی ناوەجوان و بەرزو بەڕێزەکانی خودا و تەسبیحات و ئەوراد و**

نزاو پاڕانەوەو موناجات و سوپاسگوزاریی خودا لەسەر نیعمەتەکانی ئیمان و هەموو بەخششەکانی تریش و قسەی خێر کردن وبانگەواز کردن و خوێندنی قورئان و ئامۆژگاری کردنی خەڵکان بەگشتی و موسڵمانان بەتایبەتی، زیکری هۆش و عەقل و خەیاڵیش بریتی یە لە تاوتوێ کردنی یاسا خوداییەکان و هەڵبژاردنی بەرنامەی ڕاستەقینەی خوداو خەیاڵ کردن لەژیاننامەی پێغەمبەران و حەشرو حیساب و دواڕۆژو بەهەشت و دۆزەخ و سەرەنجامی مرۆڤەکان بەگشتی و باوەڕداران بەتایبەتی، زیکری دڵ بریتی یە لە موعایەشەی قەلبی لەگەڵ خوداو قبووڵکردنی حەق و ئایین و خۆشویستنی خوداو پێغەمبەران ومەلائیکەتان وباوەڕداران و، لەناخی دڵ و دەروونـدا خوا بەخوا زانین و خۆ بەبەندە زانین و یەکلایی بوونەوە بۆ پەیامە ئیلاهییەکان و جێ کردنەوەی دانە دانەیان لەدڵ دا، زیکری جەستەو کردەوەش بریتی یە لەڕەنگدانەوەی تەواوی پەیامە خوداییەکان لەئاکارو ڕەوشتداو بەکردەوە سەلماندنی سوپاسگوزاری لەسەر نیعمەتەکان و نزیك بوونەوەو پڕبوون بەڕەوشتە جوانەکان و دوورکەوتنەوەو خۆ بەتاڵ کردن لەڕەوشتە ناشایستەکان و سەلامەتکردنەوەی دڵ لەنەخۆشییە کوشندە دەروونییەکان و ڕەنگدانەوەی ئاکارە جوانەکان لەژین و دینیدا، بەکورتی و پوختی هەمیشە لەگەڵ خواژیان و لەیادبوونی خوداو ڕەنگدانەوەی ئەم هەقیقەتی لەگەڵ خواژیان و لەیادبوونی خوایە لەتەواوی هەست و

نەست وخەون وخەياڵ و بيرو دڵ و دەروون و جەستەو كردەوەو تەواوی هەڵسووكەوتی ژيان و ئايينداری كردنی، ئيدی حەقيقەتی زيكر و زاكير بوون بريتييە لەوەها بوون و ئەنجامدانی هەموو ئەم شتانەی كەباسكران.

٤٩. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« إِنَّ لِلَّهِ مِائَةَ رَحْمَةٍ أَنْزَلَ مِنْهَا رَحْمَةً وَاحِدَةً بَيْنَ الْجِنِّ وَالإِنْسِ وَالْبَهَائِمِ وَالْهَوَامِّ فَبِهَا يَتَعَاطَفُونَ وَبِهَا يَتَرَاحَمُونَ وَبِهَا تَعْطِفُ الْوَحْشُ عَلَى وَلَدِهَا وَأَخَّرَ اللَّهُ تِسْعًا وَتِسْعِينَ رَحْمَةً يَرْحَمُ بِهَا عِبَادَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ». (مسلم)

واتە: خۆشەويست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
بێگومان و بەدڵنياييەوە خودا سەد ڕەحم و سۆزو ميهرەبانيی هەيە، لەو سەد ڕەحم و سۆزو ميهرەبانييە يەك دانەيانی ناردۆتە خوارەوە بۆ نێو مرۆڤەكان و جنۆكەكان و ئاژەڵان و مارو مێروو و حەشەرات و خشۆكەكان، هەربەو يەك دانە ڕەحمەيە يەكتريان خۆشدەوێت و دڵيان بۆ يەك دەسووتێت و پەرۆشی يەكترن، هەربەو يەك دانە ڕەحمەشە سۆزو ميهرەبانييان هەيە بۆ يەكترو ڕەحم بەيەكتر دەكەن لەناو خۆياندا، هەربەو يەك دانە ڕەحمەشە ئاژەڵی دڕندەو كێوی پەرۆشی و دڵ بۆسووتان و خۆشەويستی و پاراستنی هەيە بۆ بێچووەكەی، خودا (٩٩) نۆهەدو نۆ ڕەحمەكەی پاشخستووە بۆ ڕۆژی دوايی و بەهۆيانەوە ڕەحم بەبەندەكانی دەكات .

٥٠. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:

« قَالَ رَجُلٌ لَمْ يَعْمَلْ حَسَنَةً قَطُّ لأَهْلِه إِذَا مَاتَ فَحَرِّقُوهُ ثُمَّ اذْرُوا نصْفَهُ فِى الْبَرِّ وَنصْفَهُ فِى الْبَحْرِ فَوَاللَّه لَئِنْ قَدَرَ اللَّهُ عَلَيْه لَيُعَذِّبَنَّهُ عَذَابًا لاَ يُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ فَلَمَّا مَاتَ الرَّجُلُ فَعَلُوا مَا أَمَرَهُمْ فَأَمَرَ اللَّهُ الْبَرَّ فَجَمَعَ مَا فِيه وَأَمَرَ الْبَحْرَ فَجَمَعَ مَا فِيه ثُمَّ قَالَ لِمَ فَعَلْتَ هَذَا قَالَ مِنْ خَشْيَتِكَ يَا رَبِّ وَأَنْتَ أَعْلَمُ. فَغَفَرَ اللَّهُ لَهُ ». (مسلم)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**پیاوێك كەهیچ خێرو چاكەیەكی نەكردبوو لەژیانیدا بە خانەوادەو مناڵەكانی خۆی گوت: ئەگەر مردم جەستەكەم بسووتێنن و دواتر نیوەی خۆڵەمێشەكەی لەگەڵ هەوا بەوشكاییدا بڵاوبكەنەوەو نیوەكەی تریشی فڕێ بدەنە ناو دەریا، سوێند بەخوا ئەگەر خودا دەستی بەسەرما ڕابگات ئەوا سزاو ئازارێكم دەدات هیچ كەسی لەم چەشنەی سزاو ئازار نەدابێت لەتەواوی دروستكراوەكانی جیهانییان، جا كاتێ ئەم پیاوە مرد خانەوادەو منداڵەكانی فەرمانەكەیان جێ بەجێ كردو سووتاندییان و دواتر نیوەی خۆڵەمێشەكەیان بەهۆی باوە لەوشكاییدا بڵاوە پێكردو نیوەكەی تریشیان خستە نێو دەریاوە، خودا فەرمانی بە وشكایی كرد هەموو ئەوبەشەی لەلای بوو كۆی كردەوەو ئامادەی كرد، هەروەها فەرمانی بە دەریاش كرد هەموو ئەوەی لەلای ئەویش بوو كۆی كردەوەو ئامادەی كردو ئیتر كردییەوە بە پیاوەكەی جاران و**

لێی پرسی: بۆچی وات کرد؟ پیاوەکە وتی خودایە لەترسی تۆ وام کردو خۆشت باش دەزانی(کە ڕاست دەکەم)، ئیدی خوداش لێی خۆشبوو.

## تێبینی //

ئەم فەرموودەیە چەند شتێکمان لەچۆنیەتی مامەڵەو هەڵسوکەوتی بەندە لەگەڵ خوداو چۆنیەتی دەسەڵات و بەرخوردی پەروەردگار لەگەڵ بەندەکانی فێردەکات:

١- هەرچەندی بەندە گوناهی زۆربێت نابێ بێ ئومێد بێت لە ڕەحمەت و لێخۆشبوونی خودا بەمەرجی خوا بەتاك ناسینی ڕاستەقینە و هاوبەش بۆ بڕیارنەدانی.

٢- خودا حسابی لەگەڵ دڵ ودەروونە و پاداشت و سزای خاوەنەکەی لەسەر ئەو ئیحساس و هەست و هەڵوێستە دەروونییانە دەداتەوە کە لەدڵدا بەڕاستەقینەیی وجوودیان هەیەو باوەڕی دامەزراویان پێی هەیە.

٣- خودا تەمەشای گەورەیی و بچووکی و کەمی و زۆری چاکەو خێرو تاوان وگوناهان ناکات بۆ پاداشت وسزا پێ بەخشین، بەڵکو تەماشای ئاست وقەبارەی گەرمیی یان ساردی، زیندوویێتی یان مردویێتی دڵی خاوەنەکەی دەکات لەپەیوەستی یان لەپچڕانی لەگەڵ خودادا.

٤- بێ نیاز نەبوون لەخودا و شەرم لێکردن و لێترسانی و زانینی بەدڵی ئەوەی کە خودایەك هەیەو باڵادەستە بەسەر بەندەکانیداو

هەمووشتەكانى ژيانى مرۆڤ تۆماردەكات و ڕۆژێكى دياريكراوى هەيە كەبەنـــدەكانى تێـــدا كۆدەكاتـــەوەو لەتـــەواوى كارنامـــەى ژيانيـــان دەپرسێتەوە، هۆكارێكە بۆ لێخۆشبوونى خودا لەبەندە تاوانكارەكانى.

٥١. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِنَّمَا مَثَلُ الْمُؤْمِنِ حِينَ يُصِيبُهُ الْوَعْكُ أَوِ الْحُمَّى كَمَثَلِ حَدِيدَةٍ تَدْخُلُ النَّارَ فَيَذْهَبُ خَبَثُهَا وَيَبْقَى طَيِّبُهَا ». (سنن الكبرى للبيهقي)

واتە: خۆشەويست سەلامى خوداى لەسەربێت دەفەرمووێ:

بەڕاستى نموونـەى باوەڕدار وەختێ ئێش و ئازارى پێدەگات بـەهۆى نەخۆشـى گەشـكە، يـان كـە (تـا)ى لێـدێت وەكـو نموونـەى ئـەو پارچـە ئاسـنە وايـە كەدەخرێتـە ناوئـاگرەوە، ژەنـگ و ژارو پيـسييەكانى لـێ دەبنەوەو چاك و پاكەكەشى دەمێنێتەوە.

بەواتا//

مرۆڤى باوەڕدار هـەركاتێك نەخۆشـى و ناخۆشـى ڕووى تێبكـات ئـەوا خـودا بـەهۆى ئـەم نەخۆشـى و ناخۆشـييانەوە كەبەسـەرى دێـت وردە وردە گوناهـــەكانى لـــێ هەڵـــدەوەرێنێت و پـــاكى دەكاتـــەوە لەكەموكوڕييـەكانى، هــەتا واى لێــدێت كاتێــك دەچــێتە مەحــشەرو ڕووبەڕووى خودا دەبێتەوە هيچ گوناهێكى پێوە نەماوە.

٥٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لأُمَّتِي مَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا مَا لَمْ يَتَكَلَّمُوا أَوْ يَعْمَلُوا بِهِ ». (مسلم)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:**

**خودای گەورە لە ئوممەتەکەمی بووریوە لەو گفتوگۆیانەی کە دەروون (دەربارەی گوناه و ئارەزووەکان) لەگەڵ خاوەنەکەیدا دەیکات، هەتا نەیکەنە قسە لەسەر زاریان و هەتا نەیکەنە کردەوە لە ژیانی ڕۆژانەیاندا).**

## تێبینی //

**قۆناغەکانی بەرلەکردەوە لەدەروونا پێنج قۆناغن و بریتین لە:**

**١- خاطِرَة: بە خەیاڵ داهاتنی بابەتێکی خێرا گوزەر.**

**٢- هاجِس: ڕاگرتن و بیر لێکردنەوەی بابەتی خەیاڵەکە بەنهێنی.**

**٣- حَديثُ النَّفس: گفتوگۆی دەروونیی لەسەر بابەتەکە.**

**٤- هَم: بوونە خولیای بابەتەکەو نیازگرتن بۆی.**

**٥- عَزم: یەکلابوونەوە بۆ بابەتەکەو بڕیاردان لەسەر جێ بەجێکردنی و نەخشەو پلان بۆداڕشتنی.**

**جائەوەی خۆشەویست باسی دەکات قۆناغی سێیەم (حدیث النفس)ەو تا ئەوێ مرۆڤ گوناهی لەسەر نانوسرێ و، لەوە بەدوا دوو قۆناغەکەی تر (کردنە خولیای بابەتەکەو یەکلابوونەوە بۆی**

و بڕیاردان لەسەر جێ بەجێکردنی و نەخشەو پلان بۆ دانانی) ئەگەر بەگوناهیش بۆی تۆمار نەکرێت و سزای دوا ڕۆژیشی لەسەرنەدرێت ئـەوا هەرمایـەی گلـەیی خوایـە لەسـەری و بـە بـەردەوام بـوون لەسـەرحاڵەتەکە دڵەکەی ڕوو لەنشێوو بچووکبوونەوەو تاریکبوون و وێران بوون دەڕوات و ڕەنگە بەجۆرێك لەجۆرەکان سزای دونیاییشی لەسـەربخوات: چەشـنی نەخۆشـکەوتن و زیـان لێکـەوتنی مـاددی و نائارامیی دەروونی و... هتد.

٥٣. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
( رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ، وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعقِلَ أَو يُفِيقَ ). (النسائي)

واتە: خۆشەویستمان سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی:
قەڵەمی خوا بۆ نووسینی کردەوە لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە، لەسەر نوستوو هەتا خەبەری دەبێتەوە، منداڵ هەتا گەورە دەبێت و خۆی دەناسێ، شێتیش هەتا عاقڵ دەبێتەوە یان ئاگایی بۆ دەگەڕێتەوە.

٥٤. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« عِزُّ الْمُؤمِنِ اسْتِغناؤُهُ عَنِ النَّاسِ ». (شعب الأيمان)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
سەربەرزیی بڕوادار لە بێ نیازبوونییەتی لە خەڵکی.

٥٥. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ، وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلَّا غَلَبَهُ، فَسَدِّدُوا، وَقَارِبُوا، وَأَبْشِرُوا، وَاسْتَعِينُوا بِالْغَدْوَةِ وَالرَّوْحَةِ وَشَيْءٍ مِنْ الدُّلْجَةِ» (البخاري)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:

ئا ئەو دینە {ئەو ئیسلامە} خۆش و ئاسانە، هیچ کەس نییە ئەم ئایینە لەسەر خۆی گران بکات {بەو مانایەی بیەوێ هەموو دین لەسەر خۆی جیٚ بەجیٚ بکات} ئیللا ئایین بەسەریدا زاڵ دەبێت و پەکی دەخات، کەواتە ڕێگیری لە دەروونتان بکەن لەزیادەڕەوی لەدینداری کردنتانا، ئەگەر نەتانتوانی دانە دانەی کردەوەکان بە تێرو تەواوی ئەنجام بدەن ئەوا هەوڵدەن نزیك ببنەوە لەتێرو تەواوی بەنسبە، هەمیشە میانەڕەو بن و مـوژدە دەریش بن بەنەرم و نییانی و ئاسانکاریی و میانەڕەوی، بۆخۆشتان کۆمەك وەربگرن لەو سیٚ کاتە کە کاتی چوست و چالاکییە: (بەیانیان و ئێواران و کەمێك لە نیوەی شەودا).

٥٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« يَسِّرُوا وَلَا تُعَسِّرُوا وَبَشِّرُوا وَلَا تُنَفِّرُوا » (البخاري)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:

ئـایین وهەمووشـتەکانی تـریش ئاسانکەن وگرانـی مەکـەن، هەمیشە لەهەموو شتێکا موژدە بەخش بن و خەڵکی مەڕەوێننەوە.

٥٧. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْه مِنْ وَلَده و وَالده وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ». (مسلم)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرمویٚ:

باوەڕی هیچ یەکێك لە ئێوە تەواو نابێت تا منی لە منالّەکانی و لە باوك و دایکی و لە تەواوی خەڵکی خۆشتر نەویٚ.

**مەبەست //**

لە(والد) لەم فەرموودەیەدا باوك و دایك هەردووکیانە، چونکە ئەم وشەیە لەزمانی عەرەبیدا لە جیاتی هەردووکیان بەکاردێت بەپێی یاساو بنەڕەتی {تغليب} واتە باوەدانی یەکێکیان بەسەر ئەوەی تریان.. پێشەوا (عومەری کوڕی خەتتاب: ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لەسەر بێت) دەستی لەناودەستی موبارەکی حەزرەت گیان بوو و بەتەواو صدق و صەفاو ڕاستیی دڵ و دەروونییەوە پێی وت: ئەی پێغەمبەری خودا تۆم لەهەمووکەس خۆشتردەویٚ تەنها لەنەفسی خۆم نەبیٚ، پێغەمبەریش سەلامی خودای لەسەر بێت بەرخاتری ئیمانی پێشەوا عومەر پێی فەرموو (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە باوەڕت پڕو تەواو نابێت تا لەخۆشت خۆشترت نەویٚم)، پێشەوا عومەر کەمێك وەستاو سەری داخست و بیری کردەوە ئاخر ئەوە پێغەمبەر بوو مایەو هۆکاری ڕزگاریی ئەو لەگومڕایی و تاریکایی بیٚ باوەڕییەوە بۆ

هیدایـــەت و ڕۆناكـــایی ئیـــسلام و ئیمـــان و، لەنەهامـــەتی ژیـــان و دڵتەنگییەوە بۆدڵارامی وخۆشبەختیی دونیاو دواڕۆژو، لەگرتنەبەری ڕێگای شوومی دۆزەخەوە بۆگرتنەبەری ڕێگای پڕ خێری بەهەشت، ئاخر تۆ بۆ ڕزگاریی خۆت كارێكت نەكردو نەتدەزانی بیكەی، ئەو لەخۆشت بۆخۆت دڵسۆزتربوو و هۆشی بەبەر هێنایەوەو نەجاتی دایت ئەی عومەر) ئیدی سەری بەرزكردەوەو چاوی بڕییە چاوە ئارامی بەخـــشەكانی پێغەمبـــەرو ڕاســـتگۆیانە لـــەناخی دڵ و دەروونییـــەوە وتـــی: {واللە ئیـــستا تـــۆم لەخۆشـــم خۆشـــتر دەوێ ئـــەی پێغەمبـــەری خـوا} ،خۆشەویستیش ڕووخساری موبارەكی گەشاوەتربوو و پێی فەرموو: (ئێستاو ئاوها ئیمانت پڕو تەواوە ئەی عومەر).

٥٨. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:

« الْمُؤْمنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا ». (مسلم)

واتـــە: خۆشەویـــستمان، ڕۆشـــنایی دڵ و دیـــدەمان، نـــووری ڕێگـــای بـەختیاریمان سـەلامی خـودای لەسـەر بێـت دەفـەرموێ: بـاوەڕدار بـۆ باوەڕدار وەكو پێكهاتی كۆشك وتەلار وایە، هەریەكێكیان ئەوەی تریان پتەو دەكات.

٥٩. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:

« مَن كانَ حَالفاً فَلا يَحلف إلَّا بالله ». (النسائي)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:**

**ئەو کەسەی سوێند دەخوات با تەنها سوێند بە خودا بخوات.**

**تێبینی //**

**لە چەندین فەرموودەی ترا خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت ئامۆژگاری کردووین کەهەتا پێمان دەکرێت سوێند نەخۆین، ئەگەر زۆر ناچاربووین و هەردەبوو سوێندمان خواردبایە با تەنها سوێند بەخوا بخۆین، چونکە بەڕاستی ئەگەر بەوردی لەو شتانە بکۆڵینەوە کەسوێندیان لەسەردەخورێ دەبینین ڕاستە لە ڕووکەشدا متمانەو ڕەواجێك بەشت وەك و قسەوباسەکان دەدات بەڵام لەناوەڕۆکا شکست دەهێنێ بەسەر حەقیقەتی شتەکانا، ئەگەر فرۆشتنی کاڵاو شت وەکە ئەوا حەزرەت گیان دەفەرموێ: سویند ڕەواج بەشت وەك دەدات ودەیفرۆشێت بەڵام بەرەکەت لەمایەو قازانجەکەی دەسێنێتەوە، بۆ قسەو باسیش ئەوا ڕۆشنە کەباسەکە بەسەربەخۆیی و تەنها خۆی نەیتوانیوە متمانە لەدڵ و دەروونی گوێکرەکانا دروست بکات بۆیە هاناوپەنا بردراوە بۆ سوێندخواردن، واتە سوێند خواردنەکە لاوازی حەقیقەتەکە نیشان دەدات نەك هێزو متمانەو ڕاستێتی.**

٦٠. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى وَالْيَدُ الْعُلْيَا الْمُنْفِقَةُ، وَالسُّفْلَى السَّائِلَةُ». (مسلم)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:**

**ئەو دەستەی کە بەرزو بەڕێزە چاکترو باشترە لەودەستەی کە نزم و کەمڕێزە، دەستی بەرزو بەڕێز ئەودەستەیە کە بەخشەرە، دەستی نزم و کەمڕێزیش ئەودەستەیە کەسواڵکەرو وەرگرە)..**

**تێبینی // ئەم فەرموودەیە حاڵیمان دەکات کە ئەوکەسەی کەسابەتی حەلاڵ دەکات و بەهۆیەوە بژێوی خۆی و ماڵ و منداڵەکانی دابین دەکات و هاوکاری هەژارانیش دەکات زۆر بەرزو بەڕێزترە لەوکەسەی تەمبەڵی لەکەسابەت و دابین کردنی بژێوی ژیان دەکات و هەمیشە چاوی لەدەستی خەڵکە هاوکاری بکەن و پێویستییەکانی بۆ دابین بکەن، باسی کەسێکیان لای خۆشەویست کرد سەلامی خودای لەسەر بێت کە بەڕۆژ هەر بەڕۆژووەو شەوانیش هەر بێدارەو زیکرو موناجات و قورئان و شەو نوێژان دەکات، فەرمووی: ئەی لەماڵ و نان و کەسابەتی کێ دەخوات؟ وتیان لەماڵ و کەسابەتی براکەی، کە کەسابەت دەکات و بژێوی ژیانی خۆی و خانەوادەو ئەم برایەشی دابین دەکات، خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی: براکەی لەو چاکترە.**

٦١. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« لاَ تَحَاسَدُوا وَلاَ تَنَاجَشُوا وَلاَ تَبَاغَضُوا وَلاَ تَدَابَرُوا وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا. الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يَخْذُلُهُ ،وَلاَ يَحْقِرُهُ. التَّقْوَى هَا هُنَا ». وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ « بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ » (مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی:

حەسادەت بەیەکتری مەبەن، لەفرۆشتنی کەلوپەلەکانتانا نرخێکی گرانبەهای خەیاڵی وەها مەڵێن کڕیارەکانتان سەراسیمە بکەن و واتێبگەن کە کەلوپەلەکە زۆر چاك وباش و گرانبەهایە، یان بەئەنقەست نرخێکی گرانی ناشایستەی وەها بەکاڵاکە بدەن کە هیچ پێویستتان بەکڕینی شتەکە نەبێت و تەنها بۆ ئەوەتان بێت بەم نرخ پێدانە نا ڕاستەقینەتان هەم زیان بەخاوەن کاڵاکە بگەیەنن و ئیتر پێی نەفرۆشرێ، هەم موشتەرییەکانیش بخەڵەتێن و وای لێ حاڵیی بن کە کەل وپەلەکە بەحەقیقی نایاب و گرانبەهایە، ڕق وکینە لە یەکتری هەڵمەگرن و دوژمنایەتی یەکتری مەکەن، پشت مەکەنە یەکتری و هەجری برایەتی یەکتری مەکەن، لەفرۆشتنی کەلوپەلەکانتانا هەندێکتان لەسەر هەندێکتانا مونافەسەی نرخ شکێنی و بایەخ شکێنی کاڵاکانی یەکتر مەکەن بەجۆرێك بانگی کڕیارەکانی یەکتر بکەن

و پێیان بڵێن کاڵاکانی ئەو باش نین و وەرنە لای خۆم هەم کاڵاکەم لە هی ئەو باشترەو هەم نرخەکەشم هەرزانترە، هەمووتان بەندەی خوا و برای یەکتر بن، موسڵمان برای موسلمانە، ستەمی لێ ناکات، پشتی بەرنادات وناهێڵێ ڕیسوایی وسەرشۆڕی بەسەر دابێت، بەکەم سەیری ناکات، تەقواو خۆپارێزی و لەخواترسان ((خۆشەویست سێ جار ئامارەی بە سینە ودڵ و دەروونی کرد)و فەرمووی وا لێرەدا، مرۆڤ ئەوەندەی لە خراپە و تاوان و شەڕ بەسە کە لەبەکەم گرتنی برا موسڵمانەکەی تووشی ببێ، هەموو شتێکی موسڵمان لەسەر موسڵمان حەرامە، خوێن و ماڵ و شەرەف و نامووسی)).

٦٢. قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا أَنَا عَمِلْتُهُ أَحَبَّنِي النَّاسُ، قَالَ:"ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبَّكَ اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا أَيْدِي النَّاسِ يُحِبَّكَ النَّاسُ". (مسلم)

واتە: پیاوێك وتی ئەی پێغەمبەری خوا کردەوەیەکم نیشان بدە ئەگەر جێبەجێم کرد ئەوا خەڵك خۆشیبوێم،

خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت پێی فەرموو:

دونیا بەکەم بگرەو بەکەم رازی بەو زاهیدانە بژی: خودا خۆشی دەوێیت، بێ نیازو بێ باك بەو خۆت دوور بگرە لەوەی لە دەستی خەڵکی دایە هەمووان خۆشیان دەوێیت.

٦٣. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِنَّ اللَّهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا حَتَّى لاَ يَبْغِيَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ وَلاَيَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ » (سنن ابي داود)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی:

خودا وەحی وسرووشی بۆناردم کە خاکیی وخۆ بەبچووك گرو بێ نەفس بن، تا هیچ یەکێك ستەم لەوەی تر نەکات و سنووری یەکتر نەبەزێنن، تاهیچ کەسێك فەخرو شانازی بەسەرکەسێکی ترەوە نەکات.

٦٤. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« أَكْثِرُوا ذِكْرَ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ » (سنن الترمذي)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:

زۆر بیری هەڵووشەری خۆشی و لەززەت و ئارەزووەکان بکەن (کە مردنە).

٦٥. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« لَا يَرْحَمُ اللَّهُ مَنْ لَا يَرْحَمُ النَّاسَ ». (البخاري)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:

خودا سۆزو بەزەیی و میهرەبانی و ڕەحمی خۆی بەکەسێك ناکات کە سۆزو بەزەیی نەبێت بەرامبەر خەڵکی.

٦٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَسَيَرَانِي فِي الْيَقَظَةِ وَلَا يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ بِي »
(البخا

ڕاتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:
هەرکەس منی لە خەودا بینی ئەوا بەدڵنیاییەوە لەئاگاییشدا دەمبین
هەرگیز شەیتان ناتوانێ خۆی بخاتە سەر شێوەو ڕووخساری من .

تێبینی //

ئەم فەرموودەیە مانای زۆر قووڵی لەناو خۆیدا هەڵگرتووەو زانایانی
ئـەوە باسـی زۆریـان دەربـارە کـردووە، هێنـدێك لێکدانـەو
فەرمایشتەکە ئاوها دەکەن کە هەرکەس منی لە خەودا بینی وەك ئە
ڕایە منی لەواقیعدا بینیبێ، چونکە چۆنی بینیومە وامەو شەیت
ناتوانێ خۆی بخاتە سەر شێوەو ڕووخساری من، هێندێکی تر دەڵ
مەبەست لەوەیە ئەوکەسەی لەخەودا دەیبینێ ئەوا مانای ئەوە
لەسەر ڕاستە شەقامی حەق و هیدایەتی ئیلاهییەو ڕێگاکەی ڕێگا
بەهەشتەو لەبەهەشتیشا بەحەقیقی دەیبینێت، هێندێکی تریش دەڵێ
نەخێر مەبەستی فەرموودەکە ڕۆشنەو باس لە ئاستی دەروونی
ئیمانیی دەکات و هەرکەس لەخەودا بیبینێت ئەگەر هیممەت زیا
بکات و تەکانی گەورەترو گەرم و گەشتری ئیمانی و ئەخلاقی و دڵ
دەروونیی بدات ئەوا لە واقعیداو هەر بەئاشکرا دەیبینێت، جا

ـڕێگای تەمەثثولی مەلائیکەتانەوە بێت بۆسەر شێوەو ڕووخساری
وـرەکی، چ هەر بینینی ئاشکرای خۆی بێت لە جەستەیەکی لەطیفی
ـه خەلقندەی مەعنەویدا، کە بینینەکە تایبەت دەبێت تەنها بەکەسە
ـیمەتکارە ئیمانبەرزە ئاکارجوانەکەو لەدەرکەوتنی دا خەڵکانی تر
ـبینن.

٦ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
لَوْ كَانَت الدُّنْيَا تَعْدلُ عنْدَ اللَّه جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا منْهَا
شَرْبَةَ مَاءٍ ». (سنن الترمذي)

ـته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
ـگەر دونیا ئەوەندەی باڵی مێشوولەیەك لەلای خوا بایەخی هەبوایە
ـوا قومێ ئاوی بە (کافر = داپۆشەر و بێ بایەخ سەیرکەری حەق و
ـیمەتەکان) نەدەبەخشی.

٦٠ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحبُّ الرِّفْقَ فِي الْأَمْرِ كُلِّه » (إبن ماجة)

ـته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:
خودا خۆی بە بەزەیی و نەرم و نیان و میهرەبانە، لەهەرچی کارو
ـەرمانیشە نەرم و نییانی و میهرەبانی پێخۆشە

٦٩. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« لَوْ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَوَكَّلُونَ عَلَى اللَّهِ حَقَّ تَوَكُّلِه لَرَزَقَكُمْ كَمَا يَرْزُقُ الطَّيْـرَ أَلَا تَرَوْنَ أَنَّهَا تَغْدُو خِمَاصًا وَتَرُوحُ بِطَانًا » (الترمذي)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
ئەگەر ئێوە پشت بەخوا ببەستن پشت پێبەستانی تەواو و ڕاستەقینە، ئـەوا لەلایـەن خـوداوە بـژێوی ژیـان و رزق و ڕۆزی دەدرێـن وەك چـۆن باڵنـدە ڕزق و ڕۆزیـی دەدرێـت، مەگـەر نـابینن چـۆن بـەیانیان بەسـكی خاڵیی و برسێتییەوە دەچێتەدەرو ئێوارانیش بەتێری و سكی پڕەوە دەگەڕێتەوە (لانەكەی).

٧٠. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى وَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا قَلِيلًا » (البخاري)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:
مـن وسەرپەرشـتكاری یـەتیم وەكـو ئـەم دوو پەنجـە وایـن لەبەهەشـتا: { ئاماژەی بـە پەنجـەی شـەهادە و پەنجـەی ناوەڕاسـتی كـردو كـەمێكی لێك جودا كردەوە }... مەبەسـت لەسەرپەرشـتی كردنـی یـەتیمان هـەم دابـین كردنـی بـژێوی ژیـان و پێویـستییەكانی دونیایانـە، هـەمیش پەروەردەی ئیمانی ودەروونی وئەخلاقیاتیانە.

٧١. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« اتَّقِ الْمَحَارِمَ تَكُنْ أَعْبَدَ النَّاسِ، وَارْضَ بِمَا قَسَمَ اللَّهُ لَكَ تَكُنْ أَغْنَى النَّاسِ، وَأَحْسِنْ إِلَى جَارِكَ تَكُنْ مُؤْمِنًا، وَأَحِبَّ لِلنَّاسِ مَا تُحِبُّ لِنَفْسِكَ تَكُنْ مُسْلِمًا، وَلا تُكْثِرِ الضَّحِكَ، فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ ».

(سنن الترمذي)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ: خۆت لە قەدەغە لێکراوەکان بپارێزە دەبیتە خواپەرستترین کەس، رازی بە بەو بەشەی خودا پێی داویت دەبیتە دەوڵەمەندترین و بێ نیازترین کەس، چاکە لەگەڵ دراوسێت بکە دەبیتە (باوەڕدار) یێکی باش، چیت بۆ خۆت پێخۆشە بۆ خەڵکانیشت پێخۆش بێت دەبیتە (موسڵمان) یێکی تەواو، زۆریش پێ مەکەنە چونکە بێگومان پێکەنینی زۆر دڵ مرێنەرە.

٧٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« كَانَ عَلَى الطَّرِيقِ غُصْنُ شَجَرَةٍ يُؤْذِي النَّاسَ فَأَمَاطَهَا رَجُلٌ فَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ » (إبن ماجة – أحمد)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:

لق و چڵی درەختێك لەسەر ڕێگایەك ئازاری خەڵکی دەدا، پیاوێك بڕییەوەو لەسەر ڕێگا لایدا، بەهۆی ئەم کردارەیەوە خرایە بەهەشتەوە.

٧٣. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« وَالَّذِى نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَفَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَمْرٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ»

(سنن الترمذي)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:

سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ناچنە بەهەشتەوە هەتا ئیمان نەهێنن، وە ئیمانیشتان تەواوو پڕ نابێت هەتا یەکترتان خۆشنەوێت، ئایا کارو فەرمانێکتان نیشان بدەم کە ئەگەر جێ بەجێتان کرد بەهۆیەوە یەکترتان خۆشبوێت؟ لەناوخۆتانا سەلام بڵاو بکەنەوە)

## تێبینی //

بڵاوکردنەوەی سەلام لەم فەرموودەیەدا تەنها بەدەست بەرز کردنەوەیەك و وتنی وشەی سەلام نابێت بۆ دەوروبەر، بەڵکو دەبێ لەناخی دڵ و دەروونەوە سەلام لێکراوەکان دڵنیاییان پێ بدرێت کە ئەوان { لەمنەوە، واتە: لەسەلامکارەکەوە } سەلامەتن لە هەرچی زیانی زمان ودەست هەیە، چونکە سەلام هەم ناوێکی بەرزو پیرۆزی خوایەو هەمیش ناوو ناوەرۆکی {موسڵمان } لەوییەوە سەرچاوەی گرتووە، بۆیە خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت لە فەرموودەیەکی ترا دەیفەرموو: « الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ » { واتە: موسڵمانی چاك و باش ئەو کەسەیە کە تەواوی خەڵکی لەزمان و لەدەستی سەلامەت و بێ ئازاربن}.

٧٤. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:

« يُدْنَى الْمُؤْمنُ يَوْمَ الْقيَامَة منْ رَبِّه عَزَّ وَجَلَّ حَتَّى يَضَعَ عَلَيْه كَنَفَهُ فَيُقَرِّرُهُ بِذُنُوبِه فَيَقُولُ هَلْ تَعْرِفُ فَيَقُولُ أَىْ رَبِّ أَعْرِفُ. قَالَ فَإِنِّى قَدْ سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِى الدُّنْيَا وَإِنِّى أَغْفرُهَا لَكَ الْيَوْمَ. فَيُعْطَى صَحِيفَةَ حَسَنَاته وَأَمَّا الْكُفَّارُ وَالْمُنَافقُونَ فَيُنَادَى بِهِمْ عَلَى رُءُوسِ الْخَلاَئِقِ هَؤُلاَءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى اللَّه ». (مسلم)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

لەڕۆژی دواییدا باوەڕدار لەخودای گەورەو شکۆمەند نزیك دەکرێتەوە هەتاخواگیان دەیخاتە ژێر باڵی میهرەبانی خۆی و دانی پێدادەنێ بە سەرجەمی گوناه وتاوانەکانی، خودا پێی دەفەرموێ بێ گومان من گوناهەکانم داپۆشتی لە دونیاداو ئەمڕۆش چاوپۆشییان لێدەکەم و لێت خۆشدەبم، پاشان دەفتەری کردەوە چاکەکانی دەدرێتەوە دەست، بەڵام کافرەکان و دووڕووەکان ڕادەگیرێن وبانگ بەگوێی هەموو دروستکراوەکانی وەستێنراوی گۆڕەپانی مەحشەر دەدرێت کە ئەمانەن درۆیان بەناوی خوا کردو درۆیان لەگەڵ خواکرد.

٧٥. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
«كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ وَعُدَّ نَفْسَكَ فِي أَهْلِ الْقُبُورِ»
(سنن الترمذي)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:
وابە لەدونیا وەك ئەوەی غەریبێ بیت، یان ڕێبوارێ، وە خۆت بەیەكێ لەخەڵك و دانیشتوانی گۆڕستان بێنە ئەژمار.

## تێبینی //

مەبەست لە (غەریب) میوانێكە كە بچێتە ماڵ و شارو وڵاتێك و ئیتر ئەوشوێنە هەرچی بێت شوێن و ماڵی ڕاستەقینەی ئەو نییەو زووبێت یان درەنگ، پێی خۆشبێت یان ناخۆش هەردەبێ لێی دەرچێت و بۆماڵی ڕاستەقینەی خۆی بگەڕێتەوە، مرۆڤ میوانە لە دونیا و هەرچی بێت ماڵی ڕاستەقینەی ئەونییەو زووبێت یان درەنگ، پێی خۆشبێت یان ناخۆش دەبێ لێی دەرچێت و بەرەو ماڵی هەمیشەیی خۆی لە دوارۆژدا بگەڕێتەوە..

مەبەست لە (ڕێبواریش): كەسێكە كە بەمەبەستێكی دیاریكراو و بەرەوشوێنێكی دیاریكراو كەوتۆتە ڕێ، مرۆڤ ڕێبوارێكەو لە (لەدایك بوون) بەرەو (مردن و ڕۆژی دوایی) كەوتۆتە ڕێ و دونیا بۆئەو تەنها وێستگەیەكی كاتییەو پشوویەكی كورتی تیادەدات و ئیتر جێی دەهێڵێ و بەرەو شوێنگەی دیاریكراو و ڕاستەقینەی خۆی هەنگاو

هەڵدەگرێ كە مردن و زيندوو بوونەوەو ڕۆژى دوايى و حەشروحيساب و دواتريش يەكلايى بوونەوەى ماڵى هەميشەييەتى.. مەبەست لەوەش كە خۆت وەكو خەڵك و دانيشتوانى گۆڕستان بێنيە ئەژمار ئەوەيە:

١- لەدايك بوويت و كاروان و ڕەوڕەوەى ژينت بەرەو مردن كەوتۆتە ڕێ و بێ گومان هەر دەيگاتێ.

٢- دونيا كێڵگەيەو تۆى جوتياريش دەبێ لە زووترين ماوەدا زۆرترين دانەوێڵە (كە كردارى چاكەيە) بچێنيت چونكە هاكا مردن يەخەى گرتيت و لەپەل و پۆى خستى.

٣- دونيا خۆى هەرچەند تەمەنى درێژ بێت لەچاو ڕۆژى دواييدا زۆر كورتەو، تۆش تيايدا هەرچەند تەمەنت درێژ بێت هەر پێنج و دوو ڕۆژێكەو هەست بە تێپەرينى ناكەيت و هەر تەنها ئەو كات وماوەيەت لەلا ژيانە كە تيايدا دەژيت :

{ قَالَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِي الْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ * قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَاسْأَلِ الْعَادِّينَ } (المؤمنون ١١٢- ١١٣)

(واتە: خودا لێيان دەپرسێ چەند مانەوە لەسەر زەويدا؟ ئەوانيش لەوەلامدا دەڵێن: ڕۆژێك يان چەند ڕۆژێك تيايدا ماينەوەو لەژمێريارەكان بپرسە باشتر دەزانن).

٧٦. قَالَ رَسُولُ اللَّه –صلى الله عليه وسلم–
« الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ ».(مسلم)
واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:
خەونی بینینی ڕاست و دروست بەشێکە لە { ٤٦ } بەشی پێغەمبەرایەتی .

پێبینی //

خەونی یەکێکی ئەو بابەتانەیە کە بەپێی پێویست لای لێ نەکراوەتەوە ئەو گرنگییەی کە بەحەقیقەت هەیەتی پێی نەبەخشراوە، ئەگەر خودا خەلق و ئەمری هەبێت ئەوا خەون سەر بەشی ئەمرە، ئەمریش هەم ئاستانەی خۆی لە مەلەکووت و غەیب ئەوشتانە وەردەگرێ کە دەکەونە دەرەوەی بازنەی دەسەلات و تووری پێتێچ هەستە مادییەکە، لەم خۆیشی مایەی پێبەخشینی بنلسە بۆ غەیب و مەلەکووت و شتە نابەرهەستەکان، بەواتە واوکەری یەکترن... له مرۆڤدا خەون سەر بەعالەمی قەلب یان نەفس لان ڕووحەو تەولوی تهێتی و دەسەلاتەکانی لەوانەوە سەرچاوە گرێ، بریتییە لەو بینین و نمایشەی کە نیشانی کەسی بێ ئاگا واقیع و هەستەکان دەدرێت و لە دەرەوەی هەڵبژاردن و ویست و ئیرادەووی ئەودایە، خەونی ڕاست و دروست هەواڵ و پەیامێکی بیبییە لەلایەن خوداوە بۆ خەوبینەکەو موژدەیەکیشە بۆ دلارامی و

دامەزرانی زیاتری لەسەر ئایین و ڕەوشتەکانی، هەندێ جاریش یا
زانینی هەواڵێك یان یەکلابوونەوە لەسەر بڕیارێك یان
ئاگاداربوونەوە لە هەڵەو کەموکوڕییەکە، هەندێك لە پێغەمبەران سەلامی
خودایان لەسەر بێت لە ڕێی خەونەوە پەیامی ئیلاهییان بۆدەهات
حەزرەتی ئیبراهیمیش یەکێکی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزانەیە کەفەرمانی
سەربڕینی (پێغەمبەر ئیسماعیلی جگەرگۆشەی) لە ڕێی وەحی
خەونییەوە پێکرا، پێغەمبەر (یوسف) یش سەلامی خودای لەسەر بێت
تایبەتمەند بوو بە (تأویل) و خودای گەورە لە لێکدانەوەی خەو
شارەزای کردبوو..

دایکمان (عائیشە) ش ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لەسەر بێت بۆمان
دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: پێغەمبەر سەلامی خودای لەسەر بێت یە
لەوەی سرووشی بۆبێت لەلایەن خوداوە هەر خەونێك کە دەیبینی
وەکو ڕۆشنایی و کازیوەی بەربەیان دەهاتە دی.

٧٧. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم–

« مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ ». (أبي داود)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:
هەرکەسێك خێرو چاکەیەك دەستنیشان بکات و خەڵکانی بە
ڕێنموونی بکات ئەوا هەمان پاداشتی ئەو کەسەی دەست دەکەوێت ک
خێرو چاکەکە ئەنجام دەدات.

٧٨. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« الْمُؤْمِنُ مِرْآةُ الْمُؤْمِنِ، وَالْمُؤْمِنُ أَخُو الْمُؤْمِنِ، يَكُفُّ عَلَيْهِ ضَيْعَتَهُ وَيَحُوطُهُ مِنْ وَرَائِه » (سنن ابی داود)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
باوەڕدار ئاوێنەی باوەڕدارە، هەروەها باوەڕدار برای باوەڕدارە، بەسیەتی بۆی کە ناهێڵێ وێڵ و سەرگەردان بێ، لە دوواوەش پاسەوانی و پارێزگاری لێدەکات.

تێبینی // خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت لەبەر ئەم خاڵانەی خوارەوە باوەڕدارانی بۆ یەکتری بە ئاوێنە چواندووە:

١- ئاوێنە: وەختێ پەڵەیەکت بەڕووخسارەوە بێ بەجوانترین شێوە نیشانت دەدات بەقەبارەو ماهییەتی خۆی و بێ زیادو کەم، واتە نە گەورەترو نەبچووکتر.

٢- بە بێدەنگی پەیامەکەی خۆی دەگەیەنێ و بەهێمنی خەوشەکە بە خاوەنەکەی ئاشنا دەکات.

٣- جگە لە خۆی کەسی تری لێ ئاگادار ناکاتەوە.

٤- هەرکات تۆ لەلای خۆت پەڵەو خەوشەکەی سەر ڕووخسارت لابەریت ئەویش لەلای خۆی لای دەبات و نایهێڵێت.

٥- هەرگیز پێزانینی ئەم خەوش و پەڵەیە ناخاتە نێو فایلێك و لەکاتی تەنگانەدا بیکاتە وەرەقەی فشار لەسەر خاوەنەکەی.

٦- هەقى بەسەر تۆوە نيە پاشاى يان گەدا، زاناى يان عەوام، تووڕەى يان هێمن، سەر بە هەر زمان و ڕەگەزو نەتەوەيەك بيت ئەو بیٚ باك و بیٚ ترس و بیٚ دوودڵیی پەيامەكەى خۆى دەگەيەنێت وخەوشەكانت پیٚ ئاشنا دەكات.

٧- كاتیٚ وردو خاشيشى بكەى ئەو هەر لەسەر گەياندنى پەيامى خۆى بەردەوام دەبێت و بگرە زياتر لەجارانيش گەرم وگەش دەبێت، واتە بيكەيتە چەند پارچە ئەو لەوەندە ڕووەوە پەيامەكانى خۆى دەگەيەنیٚ و خەوشەكانت پیٚ نيشان دەدات.

٨- هەر تەنها كارى نيشاندانى ناشيرينييەكان نييە، بەڵكو لەگەڵ پەڵەو خەوشەكان تەواوى جوانييەكانيشت نيشان دەدات.

٩- لە ڕێى ئاوێنەوە نەبێت مرۆڤ عەيب و خەوش و ناتەواوييەكانى خۆى نازانێت.

٧٩. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنْ النَّاسِ الصِّحَّةُ وَالْفَرَاغُ » (البخاري)

واتە: خۆشەويست سەلامى خوداى لەسەر بێت دەفەرمویٚ:

دوو نيعمەت وبەخشش هەن خەڵكانێكى زۆر بەشخوراوو بیٚ ئاگاو زيانمەندن دەربارەيان،ئەوانيش:تەندروست باشيى ودەست بەتاڵييە.

٨٠. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« لاَ تُصَاحِبْ إِلاَّ مُؤْمِنًا وَلاَ يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلاَّ تَقِيٌّ ». (أبي داود)

خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

هەتا دەتوانی هاوڕێیەتی و هاودەمیی کەسێك مەکە باوەڕدار نەبێ

هەتا دەشتوانی با ئەوکەسە نانت بخوات کە لەخوا ترس و خۆپارێزە

**تێبینی //**

(صحبة + صاحب) بەوبرادەرێتی وهاودەمانە دەگوترێ کە:

١- توندوتۆکمە بەیەکەوە لکا بن و زۆرینەی کات بە یەکەوە ب

(هاو + دەم) ی یەکتر بن.

٢- تەمەنێکی زۆریان لەگەڵ یەك بەسەر بردبێ.

٣- شارەزای وردودرشتی رابردوو و ئێستای یەکتربن.

٤- لە لوتکەی دڵسۆزی بن بۆ یەکتری.

٥- متمانەیان بەیەکتر گەیشتبێتە ئاستی یەقین ودڵنیایی.

پێشەوا (ئەبو بەکری صدیق) رەزای خودای لەسەر بێت لەگـ

خۆشەویستمان لەوئاستە بوو، بۆیە خودا دەربارەی دەفەرموێ:

{ إِلَّا تَنْصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ اللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ الَّذِينَ كَفَرُوا ثَانِيَ اثْنَيْنِ

هُمَا فِي الْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَاحِبِهِ لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا فَأَنْزَلَ اللَّـ

سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ الَّذِينَ كَفَرُوا السُّفْلَى وَكَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (التوبة – ٤٠)

چونكە بەڕاستی ئەگەر هاوڕێیی و هاوڕێبازی وهاودەمی و خۆشەویستی گەیشتە ئەم ئاستە ئەوا بێ دەست و دڵی خۆیان كاریگەرییان دەكەوێتە سەریەكترو لەزۆربەی شتەكانا یەك بیركردنەوەو یەك هەڵوێستیان دەبێت، بۆیە خۆشەویستمان دەفەرموێ: (با هاودەمتان باوەڕدار بێت) چونكە ئەو دەمە هەموو كاریگەرییەكان بە دیوی باشەن و بەقازانجی دونیا و دواڕۆژن، مەبەست لەوەش (با ئەو كەسەی نانت دەخوا خۆپارێز و لەخواترس بێت) ئەوەیە: ئەگەر كەسەكە خۆپارێز و لەخواترس بێت لەسەر نانپێدان و ڕێزگرتن و خزمەتكردنی وەك (میوان) پاداشت وەردەگریتەوە لە دواڕۆژدا، خوانەخواستە ئەگەر وانەبوو ئەوا لەسەرنان و سەرمایەو تێچووەكەی لێپرسینەوەت لەگەڵ دا دەكرێت و ڕەنگە سزاش بدرێیت، ئەوە جگە لەوەی كەمیوانی خۆپارێزو لەخواترس چاوی خۆی دادەخات لەئاست خانەوادەو، گوێی خۆشی كەڕدەكات لە بیستنی دەنگ و باسی ئەوماڵەو، زاری خۆشی دەبەستێت لە گێڕانەوەی هەموو شتێك.

٨١. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« لاَ تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ ». (مسلم)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**هیچ چاکەیەك بە کەم و ناپوخت و بچووك سەیر مەکە، هەتتا ڕووگەشییشت لەکاتی بەیەك گەیشتن لەگەڵ براکەتا.**

٨٢. كان النبي صلى الله عليه وسلم إذا أُتِيَ بالشَّيء يقول:
« اذْهَبُوا بِهِ إلى فُلانَةٍ فَإنَّها كَانَت صَدِيقَةُ خَدِيْجَةَ، اذْهَبُوا بِهِ إلى فُلانَةٍ فَإنَّها كانت تُحِبُّ خَدِيّجةَ » (ادب المفرد للبخاري)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت کاتێك کە شتێکی بەدیاری بۆ بهاتبا دەیفەرموو: بڕۆن بیبەن بۆ فلانە ئافرەت چونکە هاوڕێ و دەستەخوشکی { خەدیجە} بوو، بڕۆن بیدەنە فلانە ئافرەت چونکە{ خەدیجە }ی خۆشدەویست.**

## تێبینی //

**ئەم فەرموودەیە هەم وەفای زۆر بەرزی خۆشەویستمان نیشان دەدات نسبەت بەخانەوادە بەگشتیی و خاتوو خەدیجەی دایکمان بەتایبەتی، هەم فێریشمان دەکات چاك و ڕێزگرو خەڵات بەخش بین نسبەت بەهاوڕێ و خۆشەویستانی باوك ودایك و خێزانەکانمان.**

٨٣. عن أبي برزة الأسلمي رضي الله عنه قال:

« قُلتُ يا رسول الله دُلَّني على عَمَل يُدْخُلُني الجَنَّة قال: أَمِط الَأذَى عَنِ طَرِيقِ النَّاس » (ادب المفرد للبخاري)

واتە: لە ئەبوو بەرزەی ئەسلەمیەوە گێردراوەتەوە وتی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (سەلامی خودای لەسەربێت) کردارێکم پێنیشان بدە بمباتە بەهەشتەوە، خۆشەویست سەلامی خوای لەسەربێت: فەرمووی (شتی) ئازاربەخش لەسەر ڕێگای خەڵکی لادە.

## تێبینی //

ئەم فەرموودەیە گشتگیرەو تایبەت نیە بەشتێکی دیاری کراوەوە، هەروەها تایبەتیش نیە تەنها بەشتی ماددیەوە، بەڵکو هەرشتێکی ئازار بەخش ماددی بێت یا مەعنەوی و ڕێگربێت لەسەر ڕێگەی بەرەو خواچوونی باوەڕداران: تۆ لای بەریت و ڕێگا تەخت بکەیت بۆ باوەڕداران تا بەسانایی و بێ کێشەو گرفت ڕێگای بەرەو خوایان بگرنەبەر ئەوا بەرئەو موژدە موبارەك و دڵخۆشکەرەی خۆشەویست سەلامی خوای لەسەربێت دەکەویت و بەهۆیەوە دەچیتە بەهەشتەوە، بۆ نموونە کەسێك قەرزاربێت و قەرزەکە پشتی چەماندبێتەوەو هەمیشە لەخەم وخەیاڵی چۆنیەتی دانەوەی دابێت و نەتوانێ بەپێی پێویست بپەرژێتە سەرعیبادەتەکانی، تۆ بێیت ئەم بارسوکییەی بۆ بکەیت و ئەم ئازارە لەسەر ڕێگای بەرەو خواچوونی لابەریت ئەوا

بەدڵنیایەوە بەر ئەو موژدە خۆشەی خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەکەویت و انشاءالله بەهۆیەوە دەچیتە بەهەشتەوە، هاوسەرداركردن و ماڵ و ناوماڵ بۆ دانان و، هەروەها دوورخستنەوەی لەگوناە و خستنەسەر ڕاستەشەقامی هیدایەتی ئیلاهیش هەر بەهەمان شێوەن.

٨٤. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إنْ قَامَت السَّاعةُ وَفِي يَد أَحَدكُم فَسِيلةٌ فَإنْ استَطاعَ أنْ لا تَقُومَ حَتى يَغرِسَهَا فَلْيَغرِسْهَا ». (الأدب المفرد)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

ئەگەر خەریك بوو دونیا تێك بچێ و دواڕۆژ بەرپابێ و لەدەستی یەكێكیشتان چڵ و نەمامێكی دارخورما هەبوو و بەنیازبوو بیچێنێ ئەوا ئەگەر توانی لەشوێنی خۆی هەڵنەستێ تابیچێنێ با بیچێنێ.

**تێبینی //**

ئەم فەرموودە شیرینە لەشێوەی هاندان و هیوا بەخشینە بۆ مرۆڤەكان و مەبەست پێی ئەوەیە باهیچ شتێك ڕێگیریتان لێ نەكات لەكرداری چاكەو دۆشتان دانەمێنێ و پەكتان نەخات، هەتتا نزیك بوونی مردن و دواڕۆژیش. ئەم ئامۆژگارییە بۆئەوەیە تامرۆڤ وەڕس و نائومێد نەبێ لەو پرۆژەو كردارانەی كەئەمرۆ دەكرێن و لەئایندەیەكی دوورا بەروبووم دەدەن.

٨٥. قال رسولُ الله صلى الله عليه وسلم:

« إتَقُوا الظُلمَ فَإنَّ الظُلمَ ظُلماتٌ يَوم القيامَة ، واتَقُوا الشُحَّ فَإنَّ الـشُحَّ أَهلكَ مَن كَان قَبلَكُم وحَملَهُم عَلى أنْ سَفَكُوا دِمـاءَهُم ، واسـتَحَلُّوا مَحارِمَهُم » (الأدب المفرد)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

خۆپارێزی بکەن لەستەم و زۆرداری و خواردن و دەست درێژی کردنە سەرماڵ ومافی خەڵکی، چونکە ستەم تاریکایی و ( مایەی تاریک بوونی چارەنووسە ) لەڕۆژی دواییدا، هەروەها خۆ پارێزی بکەن لەچرووکی و ڕەزیلی و ڕژدیی، چونکە بەڕاستی نەتەوەو گەلانی بەر لە ئێوەی بەهیلاك و تیاچوون دا، وای لیٚ کردن لەناو خۆیاندا خوێنی یەکتر بڕێژن و حەرامەکانی نێوانیان ( لە گیان وماڵ و نامووس ) حەڵاڵ بکەن .

تێبینی // مەبەست لە (الشُحّ) چرووکی و ڕژدی و ڕەزیلی و خۆویستنێکی دەروونی وەهایە کەهەرچی خەیرە تیایدا نەبێت و هیچ بەخشینێکی ماددی و مەعنەوی لیٚ هەڵنەوەریٚ، بەچەشنێك لەتەواوی دونیا هەموو شتێکی تەنها بۆخۆی بوێت و بەهەموو نیعمەت و بەخششەکانی سەرزەوی چاوو دڵی تێر نەبێت و لەبەرامبەردا حەز نەکات کەس هیچ شتێکی بەربکەوێت و، خۆ ئەگەر بەریشی کەوت گڕی تێبەربێت لەحەسرەت و لەداخانا.

٨٦. قال رسولُ الله صلى الله عليه وسلم:

« قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا تَحَدَّثَ عَبْدِى بِأَنْ يَعْمَلَ حَسَنَةً فَأَنَا أَكْتُبُهَا لَـهُ حَسَنَةً مَا لَمْ يَعْمَلْ، فَإِذَا عَمِلَهَا فَأَنَا أَكْتُبُهَا بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، وَإِذَا تَحَدَّثَ بِأَنْ يَعْمَلَ سَيِّئَةً فَأَنَا أَغْفِرُهَا لَـهُ مَـا لَـمْ يَعْمَلْهَـا، فَـإِذَا عَمِلَهَـا فَأَنَـا أَكْتُبُهَا لَهُ بِمِثْلِهَا » (مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

خـودای شـکۆمەند دەفـەرموێ: ئەگـەر بەندەیـەکم لـەدڵ و دەروونـی خۆیدا بڕیاریدا یان بەزار وتی چاکەیەك دەکەم ئەوا چاکەیەکی بۆ دەنووسـم مـادام هێـشتا چـاکەکەی نـەکردبێ، خۆئەگـەر چـاکەکەی ئەنجامدا ئەوا بە (١٠) ئەوەندەی خۆی بۆی تۆماردەکـەم، وە ئەگـەر لـەدڵ ودەروونـی خۆیـدا بڕیاریـدا یـان نیـازی کـرد خراپەیـەك بکـات ئەوا لەو بڕیاری خراپەو نیازەی دەبوورم و چاوپۆشی دەکەم مـادام هێشتا ئەنجامی نەدابێ، خۆ ئەگەر خراپەکەی بـەکردەوە ئـەنجام دا ئەوا تەنها بە ئەندازەی خۆی لەسەری تۆماردەکەم.

## تێبینی //

یـەکێك لـەو یاسـاو ڕێـساو حیکمەتـە جوانانـەی کەلـەم فـەرموودە ئومێدبەخـشە وەردەگـیرێ ئەوەیـە کـە لەهەڵسوکەوت و مامەڵـەمان لەگــەڵ خەڵکیــدا بــەجۆرێك بەرخوردبکــەین ئەگــەر خراپــەکانیان

(دە = ١٠) بەرابەر چاکەکانیان بوو لەگەڵمانا هێشتا لێیان نەڕەنجێین و لەگۆشەی دەروونمانا دەریان نەکەین و تەرکی هاوڕێیەتییان نەکەین و نەڵێین ئیتر هیچ خێرێکیان پێوە نییەو بەکەڵکی دۆستایەتی نایەن و خۆماندوو کردن لەگەڵیانا بێ سوودەو مەقبوولی لای خوا نیین، چونکە لای خوا خراپە یەك بەیەکەو چاکەش یەك بە (دە=١٠) و هێندێك چاکە یەك بەحەفتاو هێندێکی تر یەك بەحەفسەدو زیاتریشە، کەواتە ئەوانەی خراپەکانیان دە بەرامبەر چاکەکانیانە هێشتا هەر مەقبوولی لای خودان و ئومێد هەیە کە لەدوارۆژیشدا ڕزگاریان بێت و بچنە بەهەشتیشەوە، دەی کەواتە دەبێ ئێمەش بەم شێوازە جوان و حەکیمانەیە هەڵسوکەوت و مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین و خوانەخواستە بەچاوێکی بچووك و کەمبایەخ سەیریان نەکەین، چونکە مرۆڤ لەهەڵسوکەوت و مامەڵەی لەگەڵ خەڵکانا هەتا پێی وابێ هێشتا بەرامبەرەکەی ماوە لەناو بازنەی تەندروستی مرۆڤایەتی و هێشتا نەکەوتۆتە دەرەوەی بەزەیی و میهرەبانی خواوە دڵسۆزانەتر دەتوانێ هاوکاری (ماددی و مەعنەوی) بکات و ئاسانتر دەتوانێ لەهەڵەو کەموکوڕیی و بەرخوردە هەرزەییەکانی ببوورێت.

٨٧. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فيه وَجَدَ حَلَاوَةَ الْإيمَان: أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْه ممَّا سوَاهُمَا، وَأَنْ يُحبَّ الْمَرْءَ لَا يُحبُّهُ إِلَّا للَّه، وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فـي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ في النَّارِ ». (بخاري)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

سێ شت هەن هەرکەس تێیان دابێت لە دڵیا شیرینی و تام و چێژی ئیمان هەست پێدەکات:

١- ئەوکەسە خوداو پێغەمبەری (سەلامی خودای لەسەربێت) لەهەموو کەس خۆشتربوێ.

٢- وە ئەگەر کەسێکی خۆشویست تەنها لەبەرخودا خۆشیبوێت.

٣- وەهەروەها (بەدڵ) پێی ناخۆشبێت بگەڕێتەوە ناو بێ باوەڕیی و گوناه و خراپەکاری دوای ئەوەی کەخودا رزگاری کردووە لێیان هەروەك چۆن پێی ناخۆشە فڕێی بدرێتە ناو ئاگرەوە.

٨٨. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ لاَ يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائقَهُ ». (مسلم)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

ناچێتە بەهەشتەوە ئەوکەسەی دراوسێکەی لە شەڕو ئازارو بەڵاو گێچەڵ و دەردیسەری و ستەمی ئەمین و پارێزراو نەبێت.

٨٩. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« الإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمَانِ ». (النسائي)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرمووێ:**

**باوەڕ حەفتاو ئەوەندە لق و پەل و پۆیەیە، چاکترین و بەرزو بەڕێزترینی وتەی (لا الـه الا الله) یە، وە نزمترینیشی لابردنی ئازارە لەسەر ڕێگا، هەروەها شەرم و حەیاش لقێکە لە باوەڕ.**

**تێبینی //**

**مەبەست لە وتەی (لا الـه الا الله) جێ نشین بوونی مانا درەوشاوەو کاریگەرو ڕاستەقینەکانییەتی لە دڵداو دواتر ڕەنگدانەوەی ڕاست و دروستێتی لە هەڵوێست و کردەوەدا، مەبەست لە لادانی ئازار لەسەر ڕێگاش لابردنی هەموو جۆرەکانی ئازارە لەسەر هەموو ڕێگاکانی ژیان و هەموو ڕێگاکانی بەرەو خواچوونی مرۆڤ، بەواتە کاتێك شتێکی ئازاربەخش لەسەر ڕێگایەکی سەرەکی هاتوچۆی مرۆڤەکان هەبێت ولابریێ موژدەکە دەیگرێتەوە، لەهەمان کات ستەمێك لەسەر ڕێگای گوزەران و ژیانی مرۆڤەکان بەگشتی هەڵبگیردرێ هەر لابردنی ئازارەو، قەرزێکیش بۆقەرزارێك کە ڕێگای بەرەو خواچوونی لێ گرتبێ و بدرێتەوە، یان هاوسەر گیرییێك بۆ گەنجێك پێکبهێنرێ کە ڕێگرە بۆ بەرەو پێشچوونی ئیمانی هەرلابردنی ئازارە لەسەر ڕێگا، ئەمانە**

نموونــه بــوون و دەتــوانرێ بــۆلابردنی ئــازار لەســەر ڕێگــای مرۆڤــەکان دەیان و سەدان شێوازو شتی تر بگرینەبەر کە بەربەستن لەبەردەم دیـن و ژینی مرۆڤەکان.

٩٠. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« آتِي بَابَ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَسْتَفْتِحُ فَيَقُولُ الْخَازِنُ مَنْ أَنْــتَ فَــأَقُولُ مُحَمَّدٌ. فَيَقُولُ بِكَ أُمِرْتُ لاَ أَفْتَحُ لأَحَدٍ قَبْلَكَ ». (مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

لـە ڕۆژی دواییـدا دێمـە بـەردەرگای بەهەشـت و داوای کرانـەوەی دەرگـا دەکــەم، دەرگاوانەکــە دەپرســێ کێــی؟ منــیش لــە وەلامیــا دەڵــێم موحەممەدم، ئـەویش دەڵێـت تـەنها بۆ تـۆ فـەرمانم پـێ کـراوەو بـۆ هـیچ کەسێکی تر بەرلەتۆ دەرگا ناکەمەوە.

٩١. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« التَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ كَمَنْ لاَ ذَنْبَ لَهُ ». (إبن ماجة)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

کەسێك تەوبەی لێکردبێ و بەدڵ لەگوناه وتاوانان پەشیمان بووبێتەوە وەك ئەوکەسە وایە کە هیچ گوناه و تاوانێکی نەبێ و نەکردبێ.

٩٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« لِكُلِّ نَبِيٍّ دَعْوَةٌ دَعَا بِهَا فِي أُمَّتِه فَاسْتُجِيبَ لَهُ وَإِنِّي أُرِيدُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ أَنْ أُؤَخِّرَ دَعْوَتِي شَفَاعَةً لأُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَة ». (مسلم)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

بۆ هەموو پێغەمبەرێك (سەلامی خودایان لەسەربێت) دوعایەكی قبوولكراو هەبووەو ئەوانیش لەدونیادا كردوویانەو وەرگیراوە بۆ گەلەكەیان، منیش دەمەوێ بە ئیزن و پشتیوانی خوا دوعاكەم دوابخەم بۆ ڕۆژی دوایی و بیكەمە شەفاعەت و تكای لێخۆشبوونی خودا بۆ ئوممەتەكەم.

٩٣. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِذَا قُمْتَ فِي صَلاتِكَ فَصَلِّ صَلاةَ مُوَدِّعٍ وَلا تَكَلَّمْ بِكَلامٍ تَعْتَذِرُ مِنْهُ وَاجْمَعِ الْيَأْسَ مِمَّا فِي أَيْدِي النَّاسِ » (معجم الكبير)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرمووێ:

ئەگەر نوێژت كرد وەها نوێژ بكە كە ئەمە دواهەمین نوێژتەو ئیترخواحافیزی لە دونیا دەكەی، واتە وەك كەسێكی ماڵئاواییكار لەدونیا نوێژ بكە كە دواهەمینی ساتەكانی تەمەنی تێپەڕ دەكات.

وە قسەیەك مەكە دواتر بەناچاری ولەشەرمەزاییا پۆزشی بۆ بهێنیتەوە،هەروەها بێباك وبێ نیازبە لەوەی وا لەدەستی خەڵكی دایە.

٩٤.عَنِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- فِيمَا رَوَى عَنِ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَنَّهُ قَالَ « يَا عِبَادِى إِنِّى حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِى وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا فَلاَ تَظَالَمُوا، يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ فَاسْتَهْدُونِى أَهْدِكُمْ، يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ فَاسْتَطْعِمُونِى أُطْعِمْكُمْ، يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ فَاسْتَكْسُونِى أَكْسُكُمْ، يَا عِبَادِى إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا فَاسْتَغْفِرُونِى أَغْفِرْ لَكُمْ، يَا عِبَادِى إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّى فَتَضُرُّونِى وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِى فَتَنْفَعُونِى، يَا عِبَادِى لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ مَا زَادَ ذَلِكَ فِى مُلْكِى شَيْئًا، يَا عِبَادِى لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِى شَيْئًا، يَا عِبَادِى لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ قَامُوا فِى صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلُونِى فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِى إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ، يَا عِبَادِى إِنَّمَا هِىَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ ». (مسلم)

**واتە: لەخۆشەویستمانەوە گێڕدراوەتەوەو ئەویش لەخوای شکۆمەندەوە دەیگێڕێتەوەو خودا دەفەرموێ: ئەی بەندەکانم من**

ستەم کردنم لەسەرخۆم حەرام و قەدەغە کردووە، وە وەهاشم بڕیارو فەرمان داوە کە حەرام و قەدەغەکراوبێت لە نێو ئێوەدا بۆیە ئێوەش ستەم لە یەکتر مەکەن لەناو خۆتاندا، ئەی بەندەکانم ئێوە هەمووتان گومڕان ئیللا مەگەر یەکێك خۆم هیدایەتی بدەم و(ڕێنومای ڕاستە شەقامی ئایین و خواناسین و بەندایەتی بکەم) دەسا داوای هیدایەتم لێ بکەن تا هیدایەتتان بدەم، ئەی بەندەکانم ئێوە هەمووتان برسین تەنها ئەوکەسە نەبێت کە خۆم تێری بکەم و تێرم کردبێت، دەسا داوای خۆراك و ڕۆزیم لێ بکەن تا پێتان ببەخشم، ئەی بەندەکانم ئێوە هەمووتان ڕووت و ناپۆشتەن تەنها ئەوکەسە نەبێت کە خۆم داما پۆشیبێ و هۆشی خۆداپۆشینم پێ بەخشیبێ، دەسا داوای پۆشاك و چۆنیەتی خۆداپۆشینم لێ بکەن تا بتاندەمێ، ئەی بەندەکانم ئێوە بەشەو و بەڕۆژ دەکەونە هەڵەو کەم و کوڕی و گوناهانەوەو هەر منیشم لەهەموو تاوان و هەڵەو گوناهان خۆشدەبم دەسا لەسەر گوناه و هەڵەو تاوانەکانتان داوای لێخۆشبوونم لێبکەن با لێتان خۆشبم، ئەی بەندەکانم ئێوە قەت ناگەنە ئەوەی کە بتوانن زیانم پێ بگەیەنن تا زیانم پێ بگەیەنن، وە قەتیش ناگەنە ئەوەی کە بتوانن سوودو قازانجم پێ بگەیەنن تا سوودمەندم بکەن، ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەمین کەس ودواهەمین کەستان (واتە هەمووتان) بە مرۆڤەکان و جنۆکەکانەوە لەسەر

شێوەو حاڵی دڵی پاکترین و پارێزکارترین و لە خواترسترینی مرۆڤێکی نێوخۆتان بێت ئەوا هیچ لە موڵکی من زیادناکات، ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەمین کەس و دواهەمین کەستان (واتە هەمووتان) بە مرۆڤەکان وجنۆکەکانەوە لەسەر شێوەو حاڵی دڵی خراپترینی کەسی نێوخۆتان بێت ئەوا هیچ لە موڵکی من کەم ناکات، ئەی بەندەکانم ئەگەر هەمووتان تێکڕا بە مرۆڤ و جنۆکەوە لە دەشت وچۆڵایی و گۆڕەپانێکی کاکی بەکاکیدا بوەستن و داوای نیازەکانتانم لێ بکەن و منیش هەر یەکێکتان پێداویستی خۆی پێ ببەخشم ئەوا هیچ لەوە کەم ناکات کە لەلای منە تەنها بەقەدەر ئەوە نەبێ کە دەرزییەك بخرێتە ناو دەریایەکەوە، ئەی بەندەکانم ئەوە تەنها کاروکردەوەی خۆتانە کە من بۆتانی دەژمێرم و هەڵیدەگرم و لەسەر یەکی کۆ دەکەمەوە و لەدونیا ودواتر لە دواڕۆژیشدا حەقەکەی دەدەمەوە، جا هەرکەس خێری دەستکەوت و خێری بینی لەخۆیدا باسوپاسگوزاری خودا بکات، هەرکەسیش پێچەوانەی ئەوەی دەستکەوت و نەهامەتی بینی با لۆمەی کەس نەکات تەنها نەفسی خۆی و کردەوەکانی خۆی نەبێت.

٩٥. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« أَتَدْرُونَ مَا الْمُفْلِسُ ». قَالُوا الْمُفْلِسُ فِينَا مَنْ لاَ دِرْهَمَ لَهُ وَلاَ مَتَاعَ. فَقَالَ « إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِصَلاَةٍ وَصِيَامٍ وَزَكَاةٍ وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ هَذَا وَقَذَفَ هَذَا وَأَكَلَ مَالَ هَذَا وَسَفَكَ دَمَ هَذَا وَضَرَبَ هَذَا فَيُعْطَى هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْضَى مَا عَلَيْهِ أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ ». (مسلم)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت فەرمووی:
ئایا دەزانن کێ مایەپووچ و بێ سایەو سامان و موفلیسە؟ وتیان لای ئێمە بێ سایەو سامان وموفلیس ئەوکەسەیە کەهیچ پارەو پوول و کەل و پەلی نەبێت، بەڵام خۆشەویست سەلامی خودای لێبێت فەرمووی: بەڵکو بێگومان و بەدڵنیاییەوە بێ سایەو سامان وبێ سەرمایەو موفلیس لەئوممەتی من ئەوکەسەیە کەلە ڕۆژی دواییدا دێت بەکۆمەڵێك نوێژ ڕۆژوو زەکاتەوە بەڵام لەکارنامەو ژیاننامەیدا ئەوە هەیە کە:جوێنی بەئەو داوەو بوختانی بۆ پیاوان و ئافرەتانی داوێنپاك هەڵبەستاوەو ماڵی ئەوی خواردووەو خوێنی ئەمی ڕژاندووەو لەوی داوە، ئیتر دانە دانە لەچاکەکانی دەدرێت بەم و بەو (لەتۆڵەیاندا)، ئەگەر چاکەکانیشی کۆتاییان هات بەر لەوەی قەزاوەت و داوەری نێوان ئەوو خەڵك تەواو بێ ئەوا خراپەکانی ئەوان

وەردەگیرێ و دەخرێتەسەر دەفتەری کردەوەکانی تا هەقەکانی خەڵك کۆتایی دێت و ئەویش بەهۆیانەوە دەخرێتە ئاگری دۆزەخەوە.

٩٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ ».قَالَ رَجُلٌ إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا وَنَعْلُهُ حَسَنَةً. قَالَ: « إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ، الْكِبْرُ: بَطَرُ الْحَقِّ، وَغَمْطُ النَّاسِ ». (مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
ناچێتە بەهەشتەوە ئەوکەسەی تۆزقاڵێك خۆ بەگەورە زانینی تێدابێت، پیاوێك وتی: بەلاّم پیاو هەیە حەزدەکات جل و بەرگەکانی باش وجوان بن و، نەعل و پێلاّوەکانی جوان و باش بن، خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت فەرمووی: بەڕاستی و زۆر بەدڵنیاییەوە خودا جوانەو جوانییشی خۆشدەوێت، بەڵکو کیبرو گەورەیی نواندن بریتییە لە: خۆ بەگەورەتر گرتن لە هەق و قبووڵ نەکرنی، هەروەها بە کەم و سووك و بێ بایەخ ڕوانینە خەڵکی و شکاندنەوەیان.

٩٧. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى ». (مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
نموونەی باوەڕداران لەیەکترخۆشویستنیان و سۆزو میهرەبانییان و پەرۆشی و دڵسووتانیان بۆیەکتر وەك نموونەی یەك لاشە وایە، ئەگەر پارچەو بەشێك لەم جەستەو لاشەیە هاواری لێ هەڵساو سکاڵای ئێش و ئازاری حاڵی خۆی کرد ئەوا هەموو بەش و پارچەکانی ئەم جەستەیە بۆی دەکەونە خۆو هاوبەشی ئازاری دەبن بەشەو نەخەوتن و تا لێهاتن.

## تێبینی //

مەبەست لەم فەرمووده شیرینەی خۆشەویست سەلامی خوای لەسەر بێت ئەوەیە کەباوەڕداران لەتەواوی بەش و پارچەکانی سەر ئەم زەویە (بەجیاوازی بیروبۆچونیشیانەوە) برای یەکن و وەك یەك جەستە وان بۆ یەکتر، ئیدی لەهەر شوێنێکی ئەم دونیایە مسوڵمانان کێشەیەکیان هەبێت و ئازار بدرێن دەبێ باوەڕدارانی هەموو شوێنەکانی تر بۆیان لەخەم دابن و ئازارەکە بەدڵی ئەوانیش بگات و هەتا ئەوان ڕزگاریان نەبێت لەخەم و ناخۆشی و ئازارەکە ئەمانیش نەحەوێنەوەو خەو نەچێتە چاوەکانیانەوە.

٩٨. قِيلَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« أَرَأَيْتَ الرَّجُلَ يَعْمَلُ الْعَمَلَ مِنَ الْخَيْرِ وَيَحْمَدُهُ النَّاسُ عَلَيْهِ قَالَ « تِلْكَ عَاجِلُ بُشْرَى الْمُؤْمِنِ ». (مسلم)

**واتە: بە پێغەمبەری خوا(سەلامی خودای لەسەربێت) وترا: ئەوە چییەو چۆنە، دەبینی هێندێ جار مرۆڤ کردەوەیەکی چاك دەکات و خەڵکان لەسەر ئەوکردەوە چاکەی سوپاسگوزاری دەکەن؟ خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت لە وەڵامیا فەرمووی: ئەوە موژدەی خێراو پێشوەختی باوەڕدارە کە پێی دەگات.**

**تێبینی//**

**ئەو ئیمانداری لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی بۆ کراوە کە سوپاسگوزار دەکرێت لەسەر کردەوە چاکەکانی لەلایەن خەڵکەوە چەشنی موژدەیەکی پێشوەختی ئیلاهی، لەبەر ئەم خاڵانەی خوارەوەیە:**

**١- ئەو کارە خێرانەی کە ئەنجامییان دەدات تاك و تەنها لەبەر ڕەزامەندی خودا ئەنجامییان دەدات بە ئەوپەڕی نیازپاکی و ئیخلاصەوە.**

**٢- لەناخی دڵییەوە حەز بەو سوپاسگوزارییە ناکات لەلایەن خەڵکەوەو هەرگیز کارە خێرەکانی بەنیازی دەستخستنی شۆرەت و پیاهەڵدانی ناکات لەلایەن خەڵك و کۆمەڵگاوە.**

٣- ئەگەر دڵخۆشییەك ڕووی تێبكات لەدوای تەواوبوونی كارە خێرەكانی ئەوا تەنها لەبەر ئەوەیە كە ئەوانەی ستایشی دەكەن ئیمانداران و ڕێزدارن لەلایەن خوداو خەڵكەوە.

٩٩. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى مِنْ مَرَضٍ فَمَا سِوَاهُ إِلاَّ حَطَّ اللَّهُ بِهِ سَيِّئَاتِهِ كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا ». (مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
هیچ موسڵمانێك نییە ئازارێكی پێ بگات بەهۆی نەخۆشیی یان هەرشتێكی ترەوە ئیللا خودای گەورە بەهۆی ئەم ئازار چەشتنەیەوە گوناهەكانی لێ هەڵدەورێنێ وەك چۆن درەخت گەڵاكانی هەڵدەوەرێ.

١٠٠. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« خُذُوا مِنْ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَا يَمَلُّ حَتَّى تَمَلُّوا ».
(مسند أحمد)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
ئەوەندە كارو كردەوەو عیبادات ئەنجام بدەن كە لەتواناتان دا هەیەو پەرۆشی وتامەزرۆیی دڵتان لەگەڵیدایە، چونكە خودا هەرگیز لەپەرۆشی و ئیشتیاقی دیدار و موناجات و عیباداتی بەندەكانی سارد نابێ و بێزار نابێ، تا ئێوە ساردو بێ تاقەت نەبن.

١٠١. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« لاَ يَحِلُّ لِلْمُؤْمِنِ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثَة أَيَّامٍ » (مسلم)

**واته: خۆشەویستمان سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی:**
**دروست نیە بۆ هیچ باوەڕدارێك پشت لە براكەی خۆی بكات و لە سێ ڕۆژ زیاتر قسەی لەگەڵدا نەكات.**

## تێبینی //

**خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت لە چەندین فەرموودەی ترا گلەیی لە پشت تێكردنی باوەڕدار دەكات لە براكەی خۆی و دەفەرموێ وەختێ لە ڕێگایەكدا بە یەك دەگەن ئەویان ڕووی لەولا دەكات و ئەمیشیان ڕووی لەلاكەی تر، بەڵام موژدە دەداتە سینە صافان و پێیان دەفەرموێ ئەو دووانەی كە نێوانیان ناخۆشە ئەوكەسەی دەست پێشخەری دەكات لەسەلامكردن و ئاشتبوونەوە ئەوا خێرە گەورە و زۆرەكە هەموو بەبەر ئەو دەكەوێت.**

**ئێمە چەندین جۆر برایەتیمان هەیەو هەریەكەشیان ئەرك و مافیان بەسەر یەكترەوە هەیە:**

**١- برایەتی دایك و باوكیی، ئەوەیە كەهەردووكیان لەیەك دایك و باوك و لەیەك خانەوادە لەدایك بووبن.**

**٢- برایەتی شیریی، ئەوەیە كەهەردووكیان بەتێری شیری یەك ئافرەتیان خواردبێت، با لەخزمایەتیشا هیچی یەكتر نەبن، بەم شیر**

خواردنە دەبنە برای یەکترو ئیتر ئافرەتانی هەردوو خانەوادە دەبنە مەحرەم بۆئەم دووانە: {حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالَاتُكُمْ وَبَنَاتُ الْأَخِ وَبَنَاتُ الْأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ مِنَ الرَّضَاعَةِ } هەموو ئەرك و مافێکیان نسبەت بەیەکتر یەکسانە تەنها میرات نەبێ کەلەیەکتری ناگرن، بەڵام ئەگەر یەکێکیان هەژاربوو ئەوا هاوکاری و دەستگیرۆیی کردن و پێ بەخشین ئەرکی سەرشانیانە.

٣- برایەتی ئیمانی، ئەوەیە کەهەموو ئیمانداران برای یەکترن { إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ } (١٠ الحجرات) و لەهەر پارچەیەکی ئەم دونیایەبن سۆزو خۆشەویستی و دڵسۆزی و هاوکاری و پشتگیری و خەمخۆرییان بۆیەکتر هەیەو وەکو یەك جەستەو لاشەوان و ئازارێك بگاتە هەربەشێکی ئەم جەستەولاشەیە ئەوا تەواوی وجوودیان ئێش و ئازارەکەی پێدەگات و هەموو بۆی دەکەونە سەرپێ وبەزمان ودەست ودڵ و ماڵ و گیانیان ئازار ڕەوێنیی بۆدەکەن و تا ڕزگاری نەکەن ئەمانیش ناحەسێنەوە هەروەك خۆشەویست دەفەرموێ:

« مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى ». (مسلم)

**٤- برايەتی ئینسانی، بريتييە لەوەی كەتەواوی مرۆڤەكانی سەرزەوی بەجياوازی رەگەزو زمان و ئايين و نەتەوەكانيانەوە برای يەكترن، دڵسۆزن بۆيەكتری و وەك مرۆڤ رێز لەيەكتر دەگرن و، لەبەرامبەردا مافەكانی يەكتر پێشێل ناكەن و ستەم لەيەكتريش ناكەن، بەهەموو هێزو تونای ماددی و مەعنەوييانەوە پارێزگاری لەيەكتردەكەن و رێگای چاكی و پاكی بەيەكتر نيشان دەدەن و ئامۆژگاری بەخێری يەكتردەكەن، بۆيە تەماشادەكەی پێغەمبەران سەلامی خودايان لەسەربێت بۆگەلەكانيان چەشنی برا ناسێنراون ئەگەرچی ئەوان نالەباريش بوون و لەئاستی برايەتی كردنەوەی پێغەمبەرەكانيش نەبوون، بەڵام ئەوان هەر چەشنی برايەكی خەمخۆرو دڵسۆز ئامۆژگارييان كردوون و رێگای راستەقينەی خودايان پێ نيشان داون و لەمەترسييەكانی گوناه و تاوان و لادان و سەرپێچی و نافەرمانی خودا ئاگاداريان كردوونەتەوە:**

١- { وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ أَفَلَا تَتَّقُونَ } (٦٥ الاعراف)

٢- { وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءَتْكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ هَذِهِ نَاقَةُ اللَّهِ لَكُمْ آيَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ } (٧٣ الأعراف)

٣- { وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُم شُعَيْبًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ
إِلَهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءَتْكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ فَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلَا
تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا ذَلِكُمْ
خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ } (٨٥ الأعراف)

٤- { كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ (١٦٠) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ
أَلَا تَتَّقُونَ (١٦١) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٦٢) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ
(١٦٣) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ
(١٦٤) أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ (١٦٥) وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ
رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ } (١٦٦الشعراء)

٥- { كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ (١٠٥) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ
أَلَا تَتَّقُونَ (١٠٦) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٠٧) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ
(١٠٨) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ}
(١٠٩ الشعراء)

١٠٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ، وَلاَ تَحَسَّسُوا وَلاَ تَجَسَّسُوا » (ابي داود)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**
**خۆتان بپارێزن لە بەدگومانیی، چونکە بەڕاستی بەدگومانیی درۆترین وتەیە، هەروەها چاودێری یەکتر مەکەن و بە سیخوڕییەوە بەدوای نهێنی وهەواڵ زانینەکانی یەکترەوە مەبن.**

١٠٣. عَنْ أَبِي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ « رَجُلٌ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِمَالِهِ وَنَفْسِهِ » قَالَ ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ « مُؤْمِنٌ فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ يَعْبُدُ اللَّهَ رَبَّهُ وَيَدَعُ النَّاسَ مِنْ شَرِّهِ ». (مسلم)

**واته: لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە گێڕدراوەتەوە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر سەلامی خودای لەسەر بێت و وتی: کێ باشترین کەسە؟ فەرمووی: کەسێك کە بەماڵ و گیانی تێدەکۆشێ لەپێناوی خوادا، پیاوەکە وتی: لەدوای ئەو کێی ترە؟ خۆشەویست فەرمووی: ئیمانداریکە لە دۆڵێك لە دۆڵەکان خودای خۆی دەپەرستێ و شەڕی خۆی لەخەڵکی دەپارێزێ .**

١٠٤. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« مَا يَزَالُ الْبَلَاءُ بِالْمُؤْمِنِ وَالْمُؤْمِنَةِ فِي نَفْسِهِ وَوَلَدِهِ وَمَالِهِ حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ وَمَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ » (سنن الترمذي)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:**
**بەردەوام مرۆڤی باوەڕدار (پیاو و ئافرەت) بەگرفتاربوونی و خەمباربوونی خۆی و تیاچوونی ماڵ ومنداڵی تاقی دەکرێتەوە، تا بەخزمەتی خودای خۆی دەگات (لە دواڕۆژدا)و هیچ گوناهێکی لەسەر نەماوە.**

## تێبینی //

**ئەم فەرموودەیە حاڵییمان دەکات کە هەرچی دەردو بەڵاو گرفتاریی هەیەو بەسەرموسڵمان دادێت ئیللا ڕەحمەتە بۆی و خودای گەورە بەهۆیانەوە گوناهەکانی هەڵدەوەرێنێ تا ڕزگاری بکات لە سزای دۆزەخ و گرفتاریی ڕۆژی دوایی، خۆشەویست لەفەرموودەیەکی ئاشکرای تردا دەفەرموێ:** مَا مِنْ شَيْءٍ يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ حَتَّى الشَّوْكَةِ تُصِيبُهُ إِلاَّ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِهَا حَسَنَةً أَوْ حُطَّتْ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ) (مسلم)

**واتە:هیچ شتێك نیە تووشی باوەڕدار بێت هەتا دڕكێكیش بێت و بچێتە جەستەی و ئازاری بدات ئیللا خودا بەهۆیەوە چاكەیەكی بۆدەنووسێت، یان خراپەیەكی لێ دەسڕێتەوە.**

١٠٥. عَنْ عُقْبَةَ بن عَامِرٍ، قَالَ: لَقِيتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا، فَقُلْتُ: مَا النَّجَاةُ؟ قَالَ:"يَا عُقْبَةُ، أَمْسِكْ عَلَيْكَ لِسَانَكَ، وَلْيَسَعْكَ بَيْتُكَ، وَابْكِ عَلَى خَطِيئَتِكَ". (سنن الترمذي)

**واتە: لەعوقبەی کوڕی عامرەوە، وتی: ڕۆژێکیان بەپێغەمبەری خوا (سەلامی خودای لەسەر بێت) گەیشتم و پێم وت: ڕزگاربوون چۆنەو بەچیە؟ ئەویش فەرمووی: ئەی عوقبە زمانت لەسەرخۆت بگرەوە کە بەخراپە لە دژت بگەڕێ، با ماڵیشت بتگرێتە خۆی و فراوانت بکات، هەروەها بەسەر هەڵەو گوناهیشتا بگری.**

**مەبەست//**

**لە گرتنەوەی زمان ئەوەیە کە درۆو بوختان و دووزمانی و جوێندان و قسەی پڕوپووچ و ناشایستەی پێ نەکرێت، مەبەست لەگرتنەخۆی ماڵیش ئەوەیە کە هەم قەناعەتت دامەزرێ لەسەر ئەو بەش و شوێن و ماڵەی کەخوا خەڵاتی کردووی و پێی ڕازیی بیت و سوپاسگوزاریشی لەسەربکەیت، هەم خەڵوەتگەیەك بێت و لەناویدا خەریکی بیرکردنەوەی قووڵ لەچارەنووست بیت و سینەو دڵ و دەروونتی پێ گەش و گەرم و ئاوەدان بکەیت و، هەمیش بۆ دووربوون لەگوناه و تاوان و لەکاتی فیتنەو ئاشووب و ئاژاوەدا ماڵەکەت بەدونیاو کۆمەڵگەی خۆت بزانی و سینەی خۆتی ئەوەندەی گەردوون پێ فراوان بکەیت، هەروەها مەبەست لەوەش کەبەسەر هەڵەو گوناهتا بگری ئەوەیە کەلەناخی دڵتا پەشیمان بیت لەو گوناه و تاوانانەی کەنەفس و شەیتان پێی کردووی و بەهۆیەوە خودات**

لەخۆت ڕەنجاندووە، چونكە پەشیمان بوونەوە لەگوناه و تاوان هۆكاری لێخۆشبوونی خودایەو گریان و فرمێسكیش پێناس و ناسنامەی دڵی سەلامەت و پەشیمانبووەوەو گەڕاوەیە بۆلای خودا.

١٠٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« اضْمَنُوا لِي سِتًّا مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَضْمَنُ لَكُمُ الْجَنَّةَ، اصْدُقُوا إِذَا حَدَّثْتُمْ، وَأَوْفُوا إِذَا وَعَدْتُمْ، وَأَدُّوا إِذَا اؤْتُمِنْتُمْ، وَاحْفَظُوا فُرُوجَكُمْ، وَغُضُّوا أَبْصَارَكُمْ، وَكُفُّوا أَيْدِيَكُمْ ». (مسند أحمد)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
ئێوە شەش شتم لەخۆتاندا بۆ مسۆگەرو جێگیرو دابین بكەن، منیش بەهەشتتان بۆ مسۆگەرو دابین دەكەم:

١) ڕاستگۆبن ئەگەر قسەتان كرد،
٢) جێ بەجێكاربن ئەگەر پەیمانتان دا،
٣) ئەگەر ئەمانەتتان لەلا دانرا پارێزەری بن و بەجوانترین شێوە بیگەڕێننەوە دەست خاوەنەكەی لەكاتی خۆیدا،
٤) داوێنتان بپارێزن (لە بێ ئابڕوویی).
٥) چاوەكانتان داخەن (لە نامەحرەم).
٦) دەستەكانیشتان بكێشنەوە لەستەم و(هەموو جۆرەكانی ناڕەوایی پێكردنی).

١٠٧. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَنْ صَمَتَ نَجَا » (سنن الترمذي)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:**
**هەرکەس بێدەنگ بوو ڕزگاری بوو.**

## تێبینی //

**ئەم فەرموودەیە حاڵیمان دەکات کەزمان بۆ خاوەنەکەی نیعمەتێکی گەورەیە ئەگەر لەزیکرو قورئان خوێندن و نوێژو ئامۆژگاریکردنی خەڵك و ڕۆشنکردنەوەی ئایین و بەرنامەی خواو چاککردنی ناخۆشیی نێوان خەڵکی بەکاربهێندرێت و، لەهەمان کاتدا نیقمەت و زیانمەند ومایەی ڕیسوا بوون و شەرمەزاری و سزاو تووشبوون بەئاگری دۆزەخە ئەگەر لەناشوکری کردن و لەدرۆو بوختان ونەمیمی و جوێندان و شکات کردن لەخەڵکی و تێکدانی نێوان خۆشیی بەکاربهێندرێت، بۆیە خۆشەویستمان سەلامی خودای لەسەر بێت وەختیٚ بەموعازی فەرموو زمانی خۆت بپارێزە، موعاز وتی بۆ ئەی پێغەمبەری خوا چما ئێمە سزاو لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکرێت بەهۆی زمانمانەوە کەقسەی پیٚ دەکەین؟**

**خۆشەویستیش سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی: بۆ هەربەهۆی دروێنەی زمانەوە نییە کەخەڵکان لەسەر ڕووخسار ڕادەکێشرێن بەرەو دۆزەخ؟**

١٠٨. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ أَنْ يَرَى أَثَرَ نِعْمَتِهِ عَلَى عَبْدِهِ »(الترمذي)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:**

**بێگومان خودای گەورە پێی خۆشە شوێنەواری بەخشش و نیعمەتەکانی ببینێ بەسەر بەندەکەیەوە کە پێی خەڵات کردووە.**

**تێبینی // ئەم فەرموودە شیرینە دوو شێوازی هەڵسوکەوتمان فێردەکات لەگەڵ ئەوبەخشش و نیعمەتانەی کەخواگیان پێی خەڵات کردووین:**

**١-چرووکی و ڕەزیلی نەکردن لەبەهرەبردن و کڕین و بەکارهێنانی نیعمەتەکان لەسنووری ڕەزامەندیی خوادا.**

**٢-جوان بەکارهێنان و ڕەنگدانەوەیان لەژیانی ڕۆژانەدا بەپێی ئەو ڕێنماییانەی کەئایین دەستنیشانی کردووە، بۆ نموونە وەختێك خواگیان ماڵ وسامانی خەڵاتی کەسێك کردووە بەوە شوێنەواری نیعمەتی سامانەکە لەسەر کەسەکە دەردەکەوێ و خوداش پێی خۆشە کە هەم پێداویستیە سەرەکییەکانی ژیانی خۆی بەتێری دەستەبەر بکات و مومارەسەی مافە سروشتیەکانی پێبکات، هەمیش دەستگیرۆیی لێقەوماوان بکات و بیبەخشێتەوە بەسەر هەژاران و بەهۆیەوە بەهانایانەوە بچێت و لەگرفتارییە تاڵەکانی ژیان ڕزگاریان بکات، یان وەختێ بەخشش و نیعمەتی زانست و زانیاری بەیەکێ بەخشیوە، خواگیان پێی خۆشە هەم خۆی لەزانست و زانیارییەکە**

بەهرە وەرگریٚ و بیانکاتە کردەوە لەخۆیدا، هەم فیٚری خەڵکانی تریشی بکات و هانیان بدات و ئامۆژگارییان پیٚبکات تا بەرچاو ڕۆشنیی بیٚت بۆ ژیانی دونیا و دواڕۆژیان.

١٠٩. عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ:

« إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ تَفَرَّغْ لِعِبَادَتِي أَمْلَأْ صَدْرَكَ غِنًى وَأَسُدَّ فَقْرَكَ وَإِلَّا تَفْعَلْ مَلَأْتُ يَدَيْكَ شُغْلًا وَلَمْ أَسُدَّ فَقْرَكَ » (سنن إبن ماجة)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بیٚت دەفەرمویٚ:

خودای بەرزو شکۆمەند دەفەرمویٚ: ئەی ئادەمیزاد خۆت یەکلاکەوە بۆ بەندایەتی کردنی من: سینەو دەروونت پڕدەکەم لە دەوڵەمەندی و بیٚنیازی و هەروەها دەرگای هەژاریت لەسەر دادەخەم ، خۆ ئەگەر وانەکەیت ئەوا دەستەکانت پڕدەکەم لەکارو پیشە بەلاٚم دەرگای هەژاریت بەڕوودا داناخەم.

تیٚبینی // ئەمە فەرموودەیەکی قودسییەو خۆشەویست لە خوداوە بۆی گیٚڕاوینەتەوە، فەرموودەی قودسی قسەی خوای پەروەردگارەو پیٚغەمبەر- سەلامی خودای لەسەربیٚت – بۆمان دەگیٚڕیٚتەوە، جیاوازی لەگەڵ قورئان ئەوەیە کە فەرموودەی قودسی ماناکەی هی خودایەو خۆشەویست هەمان مانا بە وشەو ڕستەو تەعبیری خۆی بۆمان بەیان دەکات، بەلاٚم قورئان هەم ماناکەی هی خودایەو هەم پیت و وشەو ڕستەو تەعبیرەکانیشی هی خودان..

١١٠. قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

«"لا تَزُولُ قَدمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ أَرْبَعِ خِصَالٍ: عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ؟ وَعَنْ شَبَابِهِ فِيمَا أَبْلاهُ؟ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَا أَنْفَقَهُ؟ وَعَنْ عِلْمِهِ مَاذَا عَمِلَ فِيهِ؟"» (معجم الكبير للطبراني)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:

لە ڕۆژی دواییدا قاچەکانی بەندە جووڵە ناکات و لەشوێنی خۆی نابزوێ تاپرسیاری دەربارەی چوار شت و خەسڵەت و خووڕەوشت و پیشەو فەرمان لێ نەکرێت،

١- دەربارەی تەمەنی کە لەچییدا کۆتایی پێ هێنا؟

٢- دەربارەی گەنجێتییەکەی کەچۆنی بەسەر بردو لەچییدا پیری کردو ماندوو و ڕزاندی؟

٣- هەروەها موڵك و ماڵ و سامانەکەی چۆنی پەیدا کردو لەچییدا خەرجی کردو بەخشییەوە؟

٤- هەروەها لەزانست و زانیاریەکەی (دەربارەی خوداو پێغەمبەران و ئایین و ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوەو هەموو بوارەکانی تری ژیان) چی پێکردو، لەچیدا بەکاری هێناو، چەندە کردەوەی لەگەڵ هاوشان کردو چۆن لەژیانی خۆیدا ڕەنگی پێداوە؟

١١١. عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: أَتى النَّبيَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجلٌ ومعهُ صَبي فَجعلَ يَضُمّه إِليه فَقال النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (أَترحَمهُ ؟)قال:نَعم،قال:( فالله أَرحَمُ بِك، مِنكَ بِه وهُو أرحَم الرَّاحمين) (أدب المفرد)

**واتە: لەئەبو هورەيرەوە ڕەزاى خوداى لەسەربێت وتى: پياوێك هاتە لاى خۆشەويست و منداڵێكى پێ بوو بەسينەو باوەشى خۆى دەنووساند، خۆشەويست سەلامى خوداى لەسەربێت فەرمووى: بەزەييت پێيدا دێتەوەو سۆزو ميهرەبانيت هەيە بۆى؟ پياوەكە گوتى بەڵێ، خۆشەويست فەرمووى: بەدڵنياييەوە خودا بەسۆزو ميهرەبانترە بۆتۆ لەسۆزو بەزەيى تۆ بۆ ئەم منداڵە، بەڕاستى خوا بەڕەحم و سۆزو بەزەيى و ميهرەبانترينى ميهرەبانانە.**

١١٢. عن جرير رضي الله عنه قال:

« ما رآني رَسُولُ اللَّـهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مُنْذُ أَسلَمْتُ إلا تَبَسَم في وجهي » (ادب المفرد للبخاري)

**واتە: جەرير دەڵێ: لەو ڕۆژەوەى موسڵمان بووم خۆشەويست سەلامى خوداى لەسەربێت هەرجارێ منى بينيبێ ئيللا بە ڕووى گەش و خەندە ئامێزەوە لە ڕووخسارمى ڕووانيوە.**

١١٣. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« من صُنِع إليه معروفٌ فليُجزِه ، فإن لم يجد ما يُجزيه فليُثْنِ عليه،

فإنه إذا أثْنَى فقد شَكَرَهُ » (ادب المفرد للبخاري)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

هەرکەس چاکەیەکی لەگەڵ کرا با پاداشتی چاکەکارەکە بداتەوە، خۆ ئەگەر نەیبوو یان بۆی نەڕەخسا پاداشتی بداتەوە با ناوی بەچاکە بەرێ و بەخێر باسی بکات و بەسەریا هەڵبدا، چونکە ئەگەر ناوی بەچاکە بردو بەخێر باسی کردو ستایشی کرد ئەوا سوپاسگوزاریی چاکەکارەکەی کردووە.

١١٤. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« أَتَانِي آتٍ مِنْ عِنْدِ رَبِّي فَخَيَّرَنِي بَيْنَ أَنْ يُدْخِلَ نِصْفَ أُمَّتِي الْجَنَّةَ وَبَيْنَ الشَّفَاعَةِ فَاخْتَرْتُ الشَّفَاعَةَ وَهِيَ لِمَنْ مَاتَ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا

(سنن الترمذي)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:

هاتووێك (مەلائیكەتێك) هات بۆ لام لەلایەن پەروەردگارمەوەو سەرپشکی کردم لەنێوان ئەوەی کەنیوەی ئوممەتەکەم بچنە بەهەشت و لەنێوان تکاو شەفاعەت کردنم بۆیان، من تکا وشەفاعەت کردنم هەڵبژارد، ئەویش بۆکەسێکە کە لەسەر حاڵێکا مردبێ (بەدڵ و بەزمان و بەکردەوە) هیچ هاوەڵی بۆ خوا بڕیار نەدابێ.

١١٥. سُئلَ النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّه عَزَّ وَجَلَّ فَقَالَ؟ الصَّلَاةُ عَلَى وَقْتِهَا قَالَ ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ ثُمَّ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ قَالَ ثُمَّ أَيٌّ؟ قالَ ثُمَّ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّه »

(ادب المفرد للبخاري)

واتە: لە هاوەڵێکەوە پرسیار لەخۆشەویست کرا سەلامی خودای لەسەر بێت چ کردەوەیەك لەلای خودا خۆشەویسترینیانە؟
فەرمووی: ئەنجامدانی نوێژەکان لەکاتی خۆیاندا، وتی دوای ئەو چی؟ فەرمووی: چاکبوون و چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك، وتی پاشان چی؟ خۆشەویست فەرمووی: پاشان تێکۆشان لەپێناوی خواو لەرێی خوادا.

١١٦. جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: جِئْتُ أُبَايِعُكَ عَلَى الْهِجْرَةِ وَتَرَكْتُ أَبَوَيَّ يَبْكِيَانِ فَقَالَ:« ارْجِعْ فَأَضْحِكْهُمَا كَمَا أَبْكَيْتَهُمَا » (مسند ابن حبان)

واتە: پیاوێك هاتە لای خۆشەویست و پێی وت: هاتووم پەیمانت لەگەڵ ببەستم لەسەر کۆچکردن ودایك وباوکیشم تەنیا جێهێشتوون بەگریانەوە، خۆشەویست پێی فەرموو: بگەرێوە لایان خەندەیان بخەوە سەرلێو وەك چۆن ئەوانت گریاندوفرمیسکت خستنە سەرچاو.

١١٧. قال رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« لَيسَ الوَاصِلُ بِالْمُكافِيءِ وَلَكنَّ الوَاصِلَ الّذي إذا قُطِعَت رَحِمُه وَصَلَها» (الأدب المفرد)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
ئەوکەسە پارێزەری ڕشتەی خزمایەتی نییە کەنۆرە بەنۆرە هاموشۆی خزمانی بکات، بەڵکو پارێزەری ڕشتەی خزمایەتی ئەوکەسەیە لەکاتێکدا ڕشتەی خزمایەتی و نزیکایەتی لەگەڵ پچڕێندرا ئەو هەرتوندو تۆڵ گرێی دەداتەوەو ناهێڵێ خزمایەتییەکە بپچڕێ و بەردەوامی پێدەدات.

١١٨. جاء أعرابي إلى النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فقال:
« أتُقبّلون صِبيانَكم؟ فما نقبّلهم فقال النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوَ أَمْلِكُ لك أن نَزَعَ الله من قلبِكَ الرَّحمة » (ادب المفرد للبخاري)

واته: عەرەبێکی دەشتەکی هاتە لای خۆشەویستمان سەلامی خودای لەسەربێت وپێی وت: ئەوە ئێوە منداڵەکانتان ماچ دەکەن؟ بەڵام ئێمە هەرگیز ماچیان ناکەین !، خۆشەویست لەوەڵامیا فەرمووی: جا من چ لەتۆ بکەم و چیم پێدەکرێ بۆ تۆ کەخوا میهرەبانیی لەدڵی تۆدا داڕنیوە؟ بەهۆی دڵی ڕەقی خۆتەوە.

١١٩. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« المُؤمنُ الذي يُخالطُ النَّاس ويَصبرُ عَلى أَذاهُم خَيرٌ مِن الذي لا يُخالِطُ النَّاسَ ولا يَصبرُ عَلى أذَاهُم » (أدب المفرد)

واتە: خۆشەويست سەلامى خوداى لەسەربێت دەفەرمویٚ:
ئەو باوەڕدارەی کەتێکەڵیی خەڵکان دەکات و ئارام دەگرێت لەسەر ئەو ناڕەحەتی و ناخۆشی وئازارانەی کەلەلایەن ئەوانەوە پێیدەگات چاکترە ( لەلای خوداو خەڵکەوە ) لەو باوەڕدارەی کەتێکەڵیی خەڵك و کۆمەڵگا ناکات و ئارام ناگرێت لەسەر ئەو نارەحەتی و ناخۆشی و ئازارانەی کەلەلایەن ئەوانەوە پێی دەگات.

## تێبینی //

ئەم فەرمودە شیرینە لەناواخنیا دەست نیشانی ئازارو ناڕەحەتییەك دەکات کە ڕووبەڕووی باوەڕدارانی ڕاستەقینەی نێو کۆمەڵگا دەبێتەوە بەهۆی ئەو کارو ئەرك و فەرمانە ئیلاهییەی کەخراوەتە سەرشانیان، ئەویش فەرمانکردنی حەکیمانەیانە بەچاکەو ڕێگیریکردنی دڵسۆزانەیانە لەخراپەو ناپەسەندیی، چونکە خودای گەورە بەهۆی ئەم خەسڵەتە جوانەو چەند خەسڵەت و ڕەوشتێکی شکۆمەندی ترەوە ئەوانی کردۆتە باشترینی گەل و نەتەوە بۆ مرۆڤایەتی، بۆیە دەفەرمووێ: « كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ.... » (١١٠ ال عمـران) واتە: بەڕاستی ئێوە

چاکترین ئوممەتێکن کە بۆخەڵکی سەرزەوی دەرکەوتوون، چونکە فەرمان بەچاکە دەکەن و ڕێگیریش لەخراپە دەکەن و، باوەڕی توندو تۆکمەو دامەزراویش بەخوا دێنن.

١٢٠. عَنْ أَنَسٍ أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَالَ فِي الْمَسْجِدِ فَقَامَ إِلَيْهِ بَعْضُ الْقَوْمِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:« دَعُوهُ وَلاَ تُزْرِمُوهُ ». قَالَ فَلَمَّا فَرَغَ دَعَا بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ فَصَبَّهُ عَلَيْهِ. (مسلم)

واتە: لە ئەنەسەوە گێڕدراوەتەوە کە پیاوێکی دەشتەکی لە مزگەوتی خۆشەویستا میزی کرد، هەندێك لەیاران لێی تووڕە بوون و بۆی هەڵسانەوە، خۆشەویست پێی فەرموون: لێی گەڕێن و میزەکەشی پێ مەبڕن، کاتێ کە لەمیزەکەی تەواو بوو داوای سەتڵێك ئاوی کردو ڕژاندییە سەر شوێنی میزەکە.

**تێبینی //** ئەم فەرموودە شیرینە حاڵییمان دەکات کە پێغەمبەران سەلامی خودایان لەسەربێت بەگشتی و خۆشەویستمان بەتایبەتی چ سینەیەکی فراوانیان هەبووەو چەند میهرەبان بووینە لەگەڵ مرۆڤەکان، وە تێشمان دەگەیەنێت کە پەیامداران (شوێنکەوتەی پێغەمبەران) بەرخاتری گەیاندنی پەیامی ڕاستەقینەی خودا دەبێ دارای چ ڕەوشتێکی بەرزو باڵا بن و چەند خاوەن دڵ و دەروونێکی گوشادو لێبوردەو گەردەن ئازادبن.

١٢١ قال رَسُولَ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« لا يَرُدُّ الْقَضَاء إِلا الدُّعَاءُ، وَلا يَزِيدُ فِي الْعُمُرِ إِلا الْبِرُّ »

(معجم الكبير للطبراني)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**هیچ شتێك فەرمان و خواستی خوایی و چارەنووسی ناخۆشی مرۆڤ ڕەت ناکاتەوە تەنها دوعاو نزاو پاڕانەوە نەبێت، وە هیچ شتێکیش تەمەن درێژ ناکات تەنها چاکە نەبێت.**

## تێبینی //

**ئەم فەرموودەیەش حاڵییمان دەکات کە بەڵێ خودا چارەنووسی مرۆڤەکان و تەواوی شتەکانی دیاری کردووەو بەپێی یاسایەك کە ئەو دیاری کردووە مرۆڤ و تەواوی دروستکراوان دەچن بەڕێوە، بەڵام دوعا یەکێکی ئەو هۆکارانەیە کە خواگیان پێی خۆشە لە دەم و زاری بەندەکانی ببیستێ و لێی بپاڕێنەوەو داوای گۆڕینی چارەنووسی ناخۆشی خۆیانیان لێ بکەن و ئەویش بۆیان بگۆڕێت، چونکە خواگیان خۆی داڕێژەری یاساو چارەنووسەکانەو هەرخۆی قاهیرو قادیریشە بەسەریاناو گەر بیەوێت شتێك گۆڕانکاری پێبکات هیچ کەس و هێزو توانایەك ناتوانێ ڕێگیری لێبکات و لێی بپرسێتەوە، بەواتە مەقهووری یاساو ئەو چارەنووسانە نییە کەخۆی دایڕشتووەو ئیدی (حاشا لە دەسەڵاتی شکۆمەندو پایەبەرزی) تازە ئیتر خۆشی**

نەتوانێ گۆڕانكارییان تێدا بكات، بۆیە لە كاتێكا كەچارەنووس دیارییش كراوە بەڵام دوعای ڕاستەقینەی بەكوڵی دڵ لەخواگیان ڕەتی دەكاتەوەو خواگیان خۆی بە میهرەبانیی خۆی دەیگۆڕێت بەبارێكی زۆرباش و شایستەی ترا، هەروەها تەمەن دیارییش كراوە بەڵام چاكەو چاكەخوازی بە هەموو مانا فراوانەكانییەوە درێژی دەكات و بەرەكەتداری دەكات.

١٢٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَكْرَمِ أَخْلاَقِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ؟ تَعْفُو عَمَّنْ ظَلَمَكَ وَتُعْطِي مَنْ حَرَمَكَ وَتَصِلُ مَنْ قَطَعَكَ » (سنن الكبرى)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

ئایا باشترین و بەرزترین و بەڕێزترین ئاكارو ڕەوشتی دونیاو دواڕۆژتان پێ نیشان بدەم و ڕێنموونیتان بكەم بۆی؟ ئەوەیە كە هەمیشە ببووری لەوكەسەی ستەمت لێدەكات و گەردەن ئازادی بكەی، هەمیشە ببەخشی(بەخشینی ماددی و مەعنەوی) لەسەروەت و سامان و زانست و زانیاری و ئامۆژگاری چاك و پاك و... هتد: بەوكەسەی كەهەموو ئەوشتانەی لەسەر داخستووی و لێتی گرتۆتەوە، وەهەروەها بەردەوامی بەهاتوچۆو سەردان و بەسەركردنەوەی دۆستایەتی بدەیت و پاریزگاری لە شیرازەو ڕشتەی خزمایەتی بكەی لەگەڵ ئەو كەسەی كە پچڕاندوویەتی لەگەڵتا.

١٢٣. قَالَ رَجلٌ لِرسولِ اللهِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ؟
قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:« مَا أَعْدَدْتَ لَهَا ». قَالَ فَكَأَنَّ الرَّجُلَ اسْتَكَانَ ثُمَّ قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَعْدَدْتُ لَهَا كَبِيرَ صَلاَةٍ وَلاَ صِيَامٍ وَلاَ صَدَقَةٍ وَلَكِنِّى أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. قَالَ « فَأَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ ».
(مسلم)

واتە: پیاوێك بە پێغەمبەری خوای (سەلامی خودای لەسەربێت) وت: کەی وادەی هاتنی قیامەتە؟ خۆشەویست وەڵامی دایەوەو فەرمووی: چیت ئامادەکردووە بۆی؟پیاوەکە کەمێك داماو بێدەنگ بوو،پاشان وتی ئەی پێغەمبەری خوا شتێکی زۆروگەورەم لەنوێژو ڕۆژوو زەکات بۆئامادە نەکردووە، بەڵام من خوداو پێغەمبەرەکەیم خۆشدوێت، خۆشەویستیش فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەوەی کەخۆشت دەوێت.

١٢٤. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
«لَيسَ المُؤمنُ بالطَّعَانِ ولا الَّلعَانِ، ولا الفَاحِشِ،ولا البَذي » (الادب المفرد)
واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
هەرگیز ئیماندار تیرو توانج گرو دڵ برینداركەرو نەفرینكار نیە (بەواتە نەفرەت لەخەڵكی ناكات بەوچەشنەی كە لەبازنەی ڕەحمەتی خوا بیانخاتەدەرو لەسۆزو میهرەبانیی مرۆڤەكانیشیان بێ بەش بكات) و هەروەها ڕەوشت نزم و گوفتارناخۆش وناشیرین نیەو دەمپیس و جوێن فرۆشیش نیە.

١٢٥. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ: مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ ،فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّه لَهُ وِجَاءٌ ». (مسلم)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

ئەی کۆمەڵی گەنجان: هەرکەس لە ئێوە زەمینەی سازەو توانای ژن هێنانی هەیە (توانایی ماددی و مەعنەوی) باهاوسەرگیریی بکات و ژن بهێنێ، چونکە بەدڵنیاییەوە هاوسەرداری باشترین هۆکارە بۆ داخستن و دامرکاندنەوەی چاوەکان لە نامەحرەم و، هەروەها قەڵاو قەڵغانیشە بۆ پاراستنی داوێن لە داوێنپیسیی، ئەوەی نەشیتوانی ژن بهێنێ با دەست و دڵ بگرێت بە بەڕۆژووبوونەوە، چونکە بەڕاستی ڕۆژوو دەبێتە مایەی پارێزگاریی بۆی.

١٢٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُحِبُّ الصَّمْتَ عِنْدَ ثَلاثَ: عِنْدَ تِلاوَةِ الْقُرْآنِ وَعِنْدَ الزَّحْفِ وَعِنْدَ الْجِنَازَةِ » (المعجم الكبير للطبراني)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

بەدڵنیاییەوە خودای گەورەو شکۆمەند لە سێ (شوێن و کات وحاڵەت دا) بێدەنگیی پێخۆشە، لەکاتی خوێندنی قورئاندا، لەکاتی ڕۆیشتنی لەشکردا، هەروەها لەکاتی هەڵگرتنی جەنازەو بەرەو گۆڕستان بردنی مردوودا.

١٢٧ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« مَثَلُ الْمُؤْمِنِ مَثَلُ النَّخْلَة مَا أَخَذْتَ منْهَا منْ شَيْءٍ نَفَعَكَ »
(معجم الكبير للطبراني)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرمویٚ:**
**نموونەی ئیماندار (مرۆڤی باوەڕدار) وەکو نموونەی دارخورما وایە، دەست بۆ هەربەش و پارچەیەکی ببەیت سوودمەندەو قازانجت پێ دەگەیەنێت.**

**هۆکاری//**

**پێکچواندنی مرۆڤی ئیماندار بە دارخورماوە لەلایەن خۆشەویستەوە بۆ ئەم هۆکارانە دەگەڕێتەوە:**
**١- دارخورما ڕەگ و ڕیشەی بەناخی زەویدا ڕۆچووەو لق و پۆپ و بەرهەمەکانیشی سەربەرزانە بەرەو ئاسمان هەڵکشاوەو بەهۆیەوە بەرگەی هەموو مەترسییە سروشتی و ژینگەییەکان دەگرێت و بەسانایی (ڕەشەبا) کان ناتوانن بیلەرزێنن و لەڕەگ و ڕیشەی هەڵکەنێنن، بڕواداریش ئیمانەکەی چەشنی ڕەگ و ڕیشاڵی پۆلایین بەناخ و دڵ و دەروونیا پەرش و بڵاوبۆتەوەو بەرهەمەکەشی کە کردەوەی چاك و ڕەوشتی جوان و هیممەت وخزمەتگوزاری و هاوکاری و جوامێرییەکانیەتی بەئاسمانی کۆمەڵگاو مرۆڤەکانا هەڵزناوەو بەرگەی هەموو نەخۆشی و ناخۆشییەکانی کۆمەڵگا دەگرێت و هێرش و مەترسییە کۆمەڵایەتییەکان نایهەژێنن و ڕەشەبای ئارەزووە**

ناپەسەندەکان بەسانایی ناتوانێ ڕەگ و ڕیشاڵی ئیمانی لەناخ و دڵ و دەروونیا دەربهێنێ.

٢- دارخورما سوودمەندە بە بەروبوومەکەی کەخورمایەو هەروەها بەپەلکەکانی و لقەکانی و سێبەرەکەشی، بڕواداریش هەموو ژیانی سوودمەندییە: زانست وزانیارییەکانی، موڵك و ماڵ و سامانەکانی، ڕەفتارە سەنگین و گوفتارە شیرینەکانی، هاوکاری کردنەکانی بۆ خەڵکی بەگشتی، فەرمانکردنی بەچاکەو بەرهەڵستی کردنی لەخراپە، دەست پاکی ودڵپاکی و داوێن پاکی و زمان پاکی، هەروەها سۆزو میهرەبانی بۆ تەواوی مرۆڤایەتی.

٣- دارخورما ناسراوە بەدرەختی خۆڕاگریی و هێمایە بۆ ئارامی و سینەفراوانی و لێبوردەیی و نەرم و نیانیی، هەرکاتێ لێی بدرێت و داروبەردی بۆبهاوێشترێ ئەو لەوەڵاما جوانترین و خۆشترین ڕوطابیان بۆ بەردەداتەوە، باوەڕداریش وەختێ لەگەڵی بکەونە مشتومڕەوە لەبەرخودا کۆتایی پێ دەهێنێ ئەگەرچی لەسەر هەقیش بێت، کاتێ نەفامان شەڕی پێ بفرۆشن لەوەڵامیانا دەڵێ: سەلامی خوداتان لەسەربێت و لەمنەوە لەتەواوی ئازارەکانی دەست و زمانم سەرفرازو سەلامەت بن...ستەم ناکات و لە ماف خواردنی بەرامبەرەکانی چاوپۆشی دەکات و گەردەنیان ئازا دەکات و هەمیشە بەچاکە وەڵامی خراپەکانی ئازاردەرانی دەداتەوە.

٤- دارخورما بەرەکەی نزم و نزیکە لەلێکەرەوانی و بەئاسانی دەتوانرێ لێبکرێتەوەو بخورێت، باوەڕداریش بەئاسانی شتی لێ وەردەگیردرێت و ئامادەیە خۆی بێبەش بکات بەرخاتری دابین بوونی پێویستی برایەکانی، بەخشین و ناندانی بەردەوامی هەیەو خەڵکی خۆشیان دەوێت و خەلاتیان بەسەردا دابەش دەکات، هەرگیز دەست ودڵ لە بیرو باوەڕو ڕەوشتە بەرزو جوانەکانی هەڵناگرێت بەهۆی یەك ماڵیی و تێکەلاوبوونەوە هەرچەند خۆشەویستی و ئولفەت لەنێوان خۆی و خەڵکی بەهیزتر بێت.

٥- دارخورما بەردارەو هەموو کاتێك بەری دەخورێت و تێکناچێت، قەلایە بۆ ئەوکەسەی پەناى پێدەگرێت، ئەمبارکردنی ئاسانە...بڕواداریش هەمووساڵێك زەکات و صەدەقات لەماڵی خۆی دەردەکات و لەخێرکردنا لەکێ بڕکێ دایە، خواردن دەبەخشێ لەکاتی منداڵ پێدان وهاوسەرگرتن و جەژنی قوربان و لەکاتی حەج و لەکاتی هاتنەکایەو پێگەیشتنی بەرووبوومەکانی و زۆر کاتی تریش.

٦- دار خورما بەهۆی نا پەرشوبلاویی لق و پۆپەکانی ئازاری درەختەکانی دەوروبەری خۆی نادات و سنووری دیاریکراوی خۆی هەیە.. بڕواداریش بەندە بەکۆمەڵێك ڕێ و شوێنی شەرعی لەگەڵ دەوروبەرەکانی و لەمامەڵەکردن لەگەڵیانا ئازاریان نادات، هەڵسوکەوتەکانی ئاشکراو ڕۆشنن و ئاسان دەخوێندرێنەوەو دەناسرێنەوە، ناچێتە هیچ ماڵێك بەبێ مۆڵەتی خاوەنەکەی و سەیری

عەیب و عاری خەڵکی ناکات، چاوەکانیشی پارێزراو دەکات لەبینینی هەموو شتێکی ڕێ پێنەدراو، لەکوێ خودا پێی خۆشبێت و فەرمانی پێ کردبێت لەوێی دەدۆزیتەوەو لەکوێش قەدەغەکراو بێت دوورە پەرێزە.

٧- دارخورما ساڵێ جارێك پەلکە زەردو لە کەڵك کەوتووەکانی هەڵدەوەرێ...باوەڕداریش ساڵێ جارێك لەرەمەزانا بەڕۆژوو دەبێت و بەهۆیەوە گوناهەکانی هەڵدەوەرێت.

١٢٨. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَثَلُ الْمُؤْمِنِ كَمَثَلِ الْعَطَّارِ، إِنْ جَالَسْتَهُ نَفَعَكَ، وَإِنْ مَاشَيْتَهُ نَفَعَكَ، وَإِنْ شَارَكْتَهُ نَفَعَكَ ». (معجم الكبير للطبراني)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

نموونەی باوەڕدار وەکو نموونەی بۆن فرۆش وایە، ئەگەر هاوڕێیەتی بکەیت و لەگەڵی دانیشی سوودت پێدەگەینێ، ئەگەر بەلایدا تێپەڕببیت هەر سوودت پێدەگەینێ، وە ئەگەر هاوبەشی ونزیکی و شەراکەتی لەگەڵ بکەیت (لەهەر ئومورەك لەئومورەکانی ژیان وەکو کەسابەت و ژن و ژنخوازی و هەر شتێکی تریش) ئەوا هەر سوودت پێدەگەینێ.

١٢٩. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« "مَثَلُ الْمُؤْمِنِ مثل النَّحْلَةِ لا تَأْكُلُ إلا طَيِّبًا، وَلا تَضَعُ إلا طَيِّبًا" ».
(سنن الكبرى للبيهقي)

واته: خۆشەويست سەلامى خوداى لەسەربێت دەفەرموێ: نموونەى ئيماندار وەكو نموونەى مێش هەنگوين وايە، خۆراكى چاك و پاك و خاوێن نەبێت نايخوات، وە ئەوەى لێيشى دەبێتەوەو دايشى دەنێت هەرخاوێنەو چاك و پاك و خۆشە (مەبەست هەنگوينەكەيەتى).

## تێبينى //

هۆكارى پێكچواندنى مرۆڤى ئيماندار بە مێش هەنگوينەوە لەلايەن خۆشەويستمانەوە بۆ ئەم هۆكارانە دەگەڕێتەوە:

١- وشەى (النحلة) واتا بەخشينى بێ بەرامبەر، بەخشينێك چاوەڕوانى هيچ نەكرێت لەپاداشتيا، بۆيە مێش هەنگوينيش هەڵگرى ئەم نازناوو ناسنامەيە چونكە هەنگوينى صاف و خۆش و شيرين بەمرۆڤ دەبەخشێ و لەبەرامبەريا چاوەڕوانى هيچ نيە، مرۆڤى باوەڕداريش هەموو خزمەتێكى ماددى و مەعنەوى بەتەواوى مرۆڤايەتى بەگشتى و ئيمانداران بەتايبەتى دەكات و لەبەرامبەريا چاوەڕوانى هيچ پاداشتێكيان لێناكات، بۆيە تەماشا دەكەيت دانە دانەى پێغەمبەران سەلامى خودايان لەسەربێت بەهۆزو گەلەكانيان دەفەرموو: (إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٠٧) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (١٠٨) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٠٩) الشعراء

(واتە ئەى گەل و هۆزەكەم من بۆ ئێوە لەخوداوە نێردراوێكى ئەمينم، شەرم

و ترستان لەخودا ببێ و خۆپارێزی بکەن لە قەدەغەکراوەکانی و ملکەچی و دڵکەچیی بنوێنن بۆ فەرمانەکانی، من لەسەر ئەوشتانەی کەپێتان رادەگەیەنم هیچ پاداشتێکی { ماددی یان مەعنەویتان } لێ داوا ناکەم، چون پاداشتی نەبڕاوەی من تەنها لەلای پەروەردگاری جیهانییانە).

٢- وەك چۆن هەنگوین شیفای هەموو نەخۆشییەکانە بۆ خەڵکی، بەهەمان شێوە باوەڕداریش رەفتارو گوفتارە شیرینەکانی شیفاو دەرمان و چارەسازن بۆهەموو ناخۆشی و نەخۆشییە زیهنی و دەروونییەکان، فەردی وکۆمەڵایەتییەکان.

٣- مێش هەنگوین عەطف و سۆزو میهرەبانییان بۆیەکتر زۆرەو بەهەرەوەزی کاردەکەن و هەموو بەیەکەوە ئەو ئەرکەی سەرشانیان جێ بەجێ دەکەن کەبۆیان دیاری کراوە، نموونەی بڕوادارانیش وەکو نموونەی کۆشك و تەلارو بینا وایە هێندێکیان ئەوانی تریان توندو تۆڵ و مەحکەم و پۆڵایین دەکەن {الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ، يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا} ، لەخۆشەویستی و سۆزو میهرەبانیشیان بۆ یەکتر هەموویان وەکو یەك جەستە وان، ئەگەر پارچەو بەشێکی ئەو لاشەیان دەردو ئازارێکی تووشهات ئەوا هەموو بەش و پارچەکانی تر بۆی دەکەونە خۆو ئازارەکە ئەوانیش دەگرێتەوەو ئیسراحەتیان لێ هەڵدەگیرێ و هەموو هێزو توانای ماددی و مەعنەوییان دەخەنەگەڕ بۆ بنبڕکردن و چارەسەرکردنی دەردو ئازارەکە « مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى ».

٤- يەكەم كارێك كە مێش هەنگوین پێی هەڵدەستێ بریتییە لەخاوێنكردنەوەی ناو شانەكەو تەعقیمكردنی تاهەرچی پیسییە تیای نەبێت و پارێزراوبێت لەهەرچی میكرۆب و ڤایرۆسە، بڕواداریش پیشەی خاوێنكردنەوەی دڵی خۆی و بڕوادارانی تریشە وەك نیشتیمانی ڕاستەقینەیان و هەروەها پاكژكردنەوەی دونیاو ژیانی خۆی و خەڵكانە تا هیچ جۆرە نەخۆشییەكی فەردی و كۆمەڵایەتی تیا نەمێنێت.

٥- مێش هەنگوین لەناو خۆیانا بەرگریی لەیەكتر دەكەن و پاسەوانی دەكەن لەشانەكەیان و ناهێڵن بێگانە بێتە ناو ماڵەكانیانەوەو لەڕێگەی بۆنێكی تایبەتەوە یەكتر دەناسنەوەو بێگانەكانیان شانە بەدەردەكەن، بڕوادارانیش لەناوخۆیانا بەرگری و پاسەوانی لەیەكتر دەكەن بەفەرمان كردنیان بۆیەكتر بەچاكەو بەرهەڵستی كردنیان لەیەكتر لەخراپەو، ناهێڵن نەفس و شەیتان بەسەریانا زاڵ بێت. « لاَ تَحَاسَدُوا وَلاَ تَنَاجَشُوا وَلاَ تَبَاغَضُوا وَلاَ تَدَابَرُوا وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا. الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يَخْذُلُهُ وَلاَ يَحْقِرُهُ. التَّقْوَى هَا هُنَا ». وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ « بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ ».

١٣٠. « عن عبد الله بن عمرو قال: قلت: يا رسول الله ما يمنعني من غضب الله؟ قال: لا تغضب ». (إبن حبان)

واتە: لە عەبدوڵای کوری عەمرەوە گێڕدراوەتەوە، وتی: وتم ئەی پێغەمبەری خوا (سەلامی خوای لەسەر بێت) چ شتێك پارێزگاریم لێ دەکات و دەبێتە ڕێگر لەبەردەم تووڕەبوونی خودا لێم؟ خۆشەویست (سەلامی خودای لەسەر بێت) لە وەڵامیا فەرمووی: تووڕە مەبە.

**بەواتا //**

تووڕە نەبوونی بەندە لەهەڵسوکەوتی ژیانی ڕۆژانەیدا خۆی هۆکارە بۆ دروست نەبوونی تووڕەیی خودا لێی، خۆشەویستمان (سەلامی خودای لەسەر بێت) فەرموودەی تری زۆرە لەسەر تووڕەنەبوون و خۆپاراستن لەتووڕەیی، یەکێك لە ناوەڕۆك و مانای ئەوفەرموودە شیرینانە دەفەرموێ: هەرکات تووڕەبووی و ڕاوەستابوویت ئەوا دانیشە، ئەگەر دانیشتبوویت ئەوا پاڵکەوەو ڕوومەتەکانت بخەرە سەرخۆڵ و زەوی، دواتر بچۆ دەستنوێژێك بگرەو دووڕکات نوێژیش بکە، شەیتان لەئاگر دروست کراوە (بەواتا سوور و گەرمە)، نابینن کە یەکێکتان تووڕەدەبێ سووردەبێتەوەو گەرم دادێت؟ دەی تووڕەیی و گەرمی و سووربوونەوەتان بە ئاوی دەستنوێژ ساردبکەنەوەو بکوژێننەوە.

١٣١. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« لاَ إِيمَانَ لِمَنْ لاَ أَمَانَةَ لَهُ وَلاَ دِينَ لِمَنْ لاَ عَهْدَ لَهُ »(أحمد)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**باوەڕداری تەواونیە ئەوكەسەی ئەمانەت پارێز نەبێ، هەروەها دین و ئایینی تەواونیە ئەوكەسەی پەیمان پارێز نەبێ.**

**تێبینی //**

**ئەمانەت بەهەموو ئەوشتانە دەگوترێ کە خواگیان بە ئەمانەت لای داناوین بۆکاتێکی دیاریکراو و بۆئەرك وفەرمانێکی تایبەت و بۆتاقیکردنەوەی بەندەکان و دروستکراوەکان: بەوپێناسەیە ئایین دەبێتە ئەمانەت لەلای مرۆۋ و، گیان وجەستەکەی وهەموو ئەندامەکانیشی ئەمانەتن، تەواوی نیعمەتەکان ئەمانەتن لەلای مرۆۋ و سەرجەم سەروەت و سامانەکانیشی هەر ئەمانەتن لەلای، بەواتا هەم بۆکاتێکی دیاریکراون و هەمیش بۆتاقیکردنەوەی مرۆڤن، بۆیە مرۆڤی هۆشیارو باوەڕداری دانا ئەوکەسەیە کە بەجوانترین شێوە ڕێز لە ئایین دەگرێت و سوپاسگوزاری خودای لەسەردەکات و تەواوی پەیامە پیرۆزەکانی لەدڵ وگیانی دا جێنشین دەکات و لە ئاکارو ڕەوشتیدا ڕەنگیان پێ دەداتەوەو جەستەو هەموو ئەندامەکانی تریشی بۆبەندایەتی کردنی خاوەنەکەی کە(الله) یە تەرخان دەکات و، تەواوی بەخششە ماددی و مەعنەوییەکان و سەرجەم سەروەت و سامانەکانیشی بەو شێوەیە بەکاردەبات کەمایەی ڕەزامەندی خودایەو بەقازانج و لە خزمەتی بەندەکانی خوا تەواودەبێت، دواجار بۆخۆشی**

هۆکاری رزگار بوونە لەئاگری دۆزەخ و مایەی شادبوونە بە بەهەشتی ڕازاوەو تاهەتایی خودایی.

١٣٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَثَلِي كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهَا جَعَلَ الْفَرَاشُ وَهَذِهِ الدَّوَابُّ الَّتِي فِي النَّارِ يَقَعْنَ فِيهَا وَجَعَلَ يَحْجُزُهُنَّ وَيَغْلِبْنَهُ فَيَتَقَحَّمْنَ فِيهَا قَالَ فَذَلِكُمْ مَثَلِي وَمَثَلُكُمْ أَنَا آخِذٌ بِحُجَزِكُمْ عَنِ النَّارِ هَلُمَّ عَنِ النَّارِ هَلُمَّ عَنِ النَّارِ فَتَغْلِبُونِي تَقَحَّمُونَ فِيهَا » (مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

نموونەی من وەکو نموونەی پیاوێك وایە ئاگرێکی کردبێتەوە، کاتێك کەدەوروبەرەکەی ڕووناك بۆوە ئیدی پەروانەو ئەو زیندەوەرانەش کەحەزیان بەڕۆشنایی و نزیکبوونی ئاگرە خۆیان تێ فڕێدەدەنە ناوی و دەکەونە ناو ئاگرەکەوە، ئەو زۆر هەوڵ دەدات و ڕێگرییان لێدەکات کەبەرەو ئاگرەکە نەیەن و خۆیان نەخەنە ناوی، بەڵام ئەوان بەسەر هەوڵ و ڕێگرییەکانی ئەودا زاڵ دەبن و دەکەونە ناوی، ئا ئەوهایە نموونەی من و ئێوە، ئەمن کەمەربەندتان دەگرم و دەمەوێ نەچنە ناو ئاگرەوە، پێتان دەڵێم وەرنە لای من بۆئەوەی دوورکەونەوە لەئاگرو لێی پارێزراوبن، دەی دوورکەونەوە لەئاگر، بەڵام هەندێکتان بەسەر هەوڵەکانما زاڵ دەبن و دەکەونە ناو ئاگرەکەوە.

١٣٣. إِنَّمَا كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« يُحَدِّثُ حَدِيثًا لَوْ عَدَّهُ الْعَادُّ لأَحْصَاهُ. » (مسلم)

واتە: بە دڵنیاییەوە خۆشەویست کاتێ دەربارەی شتێك قسەی دەکرد ئەگەر کەسێکی ژمێریار بیویستبایە قسەکانی بژمێرێت بۆی دەژمێردرا.

**تێبینی //**

ئەم فەرموودە شیرینە دووشتی گرنگمان حاڵی دەکات:

١- خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت قسەکانی بەش بەش و پارچەپارچەو بەهێمنی و لەسەرەخۆیی کردووەو هاوەڵان وگوێگران ئاسان توانیویانە لێی تێبگەن و قسەکانی لەبەربکەن و دواتریش بەئەمانەتەوە بیگێڕنەوەو بیگەیەنن بەوهاوەڵ ومرۆڤانەی کەلەکۆڕەکەدا وجوودو حزووریان نەبووە.

٢- وانەیەکە بۆ مرۆڤایەتی بەگشتی و باوەڕداران بەتایبەتی و بانگەوازکاران زۆر بەتایبەتی تر کەهەرکاتێك قسەیان بۆ خەڵکان کرد بەهێمنی و لەسەرخۆیی و بەش بەش قسەکانیان بکەن، چونکە ئەمە هەم هێمنی و ئارامی بەدڵی گوێگران دەبەخشێ هەم هۆکارێکیشە بۆ باش تێفکرین لێیان و حاڵی بوون و ئەنجامگیری و لەبەرکردنیان و نوسینەوەیان و گفتوگۆ لەسەرکردنیان و جێبوونەوەیان لە دڵ و دەروونیاندا.

١٣٤. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« لَلَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَة عَبْده الْمُؤْمنِ منْ رَجُلٍ فِى أَرْضٍ دَوِيَّة مَهْلَكَة مَعَهُ رَاحلَتُهُ عَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ فَنَامَ فَاسْتَيْقَظَ وَقَدْ ذَهَبَتْ فَطَلَبَهَا حَتَّى أَدْرَكَهُ الْعَطَشُ ثُمَّ قَالَ أَرْجِعُ إِلَى مَكَانِى الَّذى كُنْتُ فيه فَأَنَامُ حَتَّى أَمُوتَ. فَوَضَعَ رَأْسَهُ عَلَى سَاعده لِيَمُوتَ فَاسْتَيْقَظَ وَعنْدَهُ رَاحلَتُهُ وَعَلَيْهَا زَادُهُ وَطَعَامُهُ وَشَرَابُهُ فَاللَّهُ أَشَدُّ فَرَحًا بِتَوْبَة الْعَبْد الْمُؤْمنِ منْ هَذَا برَاحلَته وَزَاده ».

(مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
خودا زۆر خۆشحاڵترە بە تەوبەو پەشیمانی و گەڕانەوەی بەندە باوەڕدارەکەی لە گوناه و تاوانان لەو پیاوەی لە بیابانێکی چۆڵ و وشکا دەڕۆیشت و ( باربەر – وشتر )ەکەشی لەگەڵدابوو کەتەواوی خواردن و خواردنەوەی لەسەر پشتی ئەو هەڵگرتبوو، لەشوێنێکا بەنیازی پشوودان لێی خەوت و پاشان کە بەئاگاهات سەیری کرد ئاژەڵەکەی لەلای نەماوەو رۆیشتووەو هەموو خواردن و خواردنەوەکەشی لەگەڵ خۆی بردووە، زۆر بەدوایدا گەڕا هەتا شەکەت و ماندوو تینوو بوو، پاشان گوتی دەچمەوە هەمان ئەو شوێنەی لێی بووم و بۆخۆم دەخەوم هەتا (لە برسێتی و تێنوێتیا) دەمرم، سەری خستەسەر باسکی و خەوت بەئومێدی ئەوەی بۆخۆی لە خەودا بمرێت، بەڵام نەمردو کە خەبەری بۆوە بینی ئاژەڵەکەی لەپشت سەری

وەستاوەو هەموو پێویستییەكان و خواردن و خواردنەوەكەشی لەسەر پشتە، بەڕاستی خودا زۆر پەرۆشترو خۆشحاڵترە بە تەوبەو پەشیمانی و گەڕانەوەی بەندە باوەڕدارەكەی لە گوناه و تاوانان لە خۆشحاڵی ئەم پیاوە بەگەڕانەوەی ئاژەڵەكەی و پێداویستیەكانی.

١٣٥. قال رسولُ الله صلى الله عليه وسلم:

« إِذَا أَمَّ أَحَدُكُمُ النَّاسَ فَلْيُخَفِّفْ. فَإِنَّ فِيهِمُ الصَّغِيرَ ، وَالْكَبِيرَ،وَالضَّعِيفَ، وَالْمَرِيضَ، فَإِذَا صَلَّى وَحْدَهُ فَلْيُصَلِّ كَيْفَ شَاءَ » (سنن الترمذي)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

ئەگەر یەكێك لەئێوە بووە ئیمام و پێش نوێژیی بۆ خەڵكان كرد، با نوێژی سووك و كورت بكات بۆیان، چونكە بەدڵنیایی لەنێو ئەواندا منداڵ وپیرو لاوازو نەخۆش هەن، كاتێكیش كە بەتەنیا نوێژی كرد باچۆنی پێ خۆشە ئاوها نوێژ بكات.

ئـــەم// فـەرموودە شـیرینە بنـەماو یاسـایەكی جوانمـان فێردەكـات لەهەڵسوكەوت و مامەڵەمان لەگەڵ خەڵكیدا، ئەویش ئەوەیە لەهەموو كـارو فەرمانـە دینیـی و دونیاییـەكانا هـەمووكات لەگـەڵ خـەڵكی بەئاسانی و سادەیی و نەرم و نیانیی و گونجاوی و موژدەبەخشیی و مۆڵەتپێدانـەوە بـەرخورد بكـەین و، بۆخۆشمـان چۆنمان پـێ خۆشـەو مایەی سازگاری دڵ و دەروونمانە ئاوا ڕەفتار بكەین.

١٣٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِنَّمَا مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالْجَلِيسِ السَّوْءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً ».

(مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

بەڕاستی و بەدڵنیاییەوە هاوڕێی چاك و هاوڕێی خراپ وەکو بۆن فرۆش و کوورەچی ئاسن وایە، کابرای بۆن فرۆش یان بۆنەکەت پێشکەش دەکات، یان لێی دەکڕی، یانیش لێیەوە بۆنێکی خۆش هەست پێدەکەی، بەڵام کوورەچی ئاسنگەر(کە بەئامرازێك فوو لەکوورەی ئاگرین دەکات بۆکاری ئاسنگەریی خۆی) یان جل و بەرگەکانت (بەپرووشکە ئاگرینەکانی) دەسووتێنێ، یانیش لێیەوە بۆنێکی ناخۆشت بۆ دێ.

١٣٧. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« لَيسَ الغِنَى عَن كَثرَةِ العَرَض ، ولكِنَّ الغِنَى غِنَى النَّفسِ » (البخاري)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

دەوڵەمەندی بەزۆریی کەل وپەل وکاڵاو کەرەستەکانی دونیاو ژیان نییە، بەڵکو دەوڵەمەندی دەوڵەمەندیی دەروون و ڕازیبوون بەبەشی خۆو بێ نیازبوونە لەخەڵکی.

١٣٨. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
«تَعَافَوا الْحُدُودَ فِيمَا بَيْنَكُمْ فَمَا بَلَغَنِي مِنْ حَدٍّ فَقَدْ وَجَبَ » (سنن النسائي)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەیفەرموو:
لەنێوانی خۆتانا لێکتری ببوورن لەوشتانەی (حەدد) ی شەرعییان لەسەرە، چونکە بەڕاستی هەر حوکمێك بهێنرێتە لای من ئەوا (حەدد) ەکەی واجب دەبێت و دەبێ جێ بەجێی بکەم.

**تێبینی** // ئەم فەرموودەیە هانی خەڵکی دەدات هەتا پێیان دەکرێت لە کێشەی نێوانیان چاوپۆشی لێکتری بکەن و لەنێوانی خۆیانا پێکهاتن ئەنجام بدەن بەرلەوەی خەڵکان پێیان بزانن و بیهێننە بەردەم دادگا، چونکە ئەگەر خەڵکان پێیان زانی و هاتنە بەردەم یاساو دادگا ئەوا بەرخاتری لاواز نەهاتنە بەر دڵ و دیدەی یاساو شەریعەت دەبێ حوکم و حەددەکان جێ بەجێ بکرێن، تا تاوانباران زەمینەیان بۆ خۆش و ساز نەبێ بۆ ئەنجام دانی کاری ناڕەوا.

١٣٩. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « لَا يَزَالُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يَغْرِسُ فِي هَذَا الدِّينِ بِغَرْسٍ يَسْتَعْمِلُهُمْ فِي طَاعَتِهِ ». (إبن ماجة)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
بەردەوام خودای شکۆمەندو بالاّ لەناو ئەم ئایینەدا چەشنی شەتڵە نەمام کەسانێکی شایستە پەیداو پەروەردە دەکات و بەجۆرێکیان دەسازێنێ کە لەگوێڕایەڵیی و فەرمانبەرداری خودا دابن.

١٤٠. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَنْ يُحْرَمِ الرِّفْقَ يُحْرَمِ الْخَيْرَ ». (مسلم)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی:**

**(هەرکەس بێ بەش بێت لەناسکیی و نەرم و نیانی، بێ بەشە لە خێرو چاکیی).**

**تێبینی // لە بنەڕەتا بێ بەش بوونەکە دەستی کەسەکە خۆی تێدایە، واتە خۆی لەتەواوی ئەوشتانە دوورخستۆتەوە کەمایەی دڵنەرمیین بۆمرۆڤەکان، بەنموونە:**

**١. قورئان خویندنی بەردەوام.**

**٢. زیکری زۆری گەرم و گەشی بە دڵ و دەروون.**

**٣. بیرکردنەوە لە مردن و ڕۆژی دوایی و لێ پرسینەوە.**

**٤. ڕشتنی فرمێسك بۆ گوناه و، لەترسی خودا.**

**٥. نان خواردن لەگەڵ هەژاران.**

**٦. دەست هێنان بەسەری یەتیمان و بەهاناوەچوونیان.**

١٤١. سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « عَن أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ الْجَنَّةَ؟ فَقَالَ: تَقْوَى اللَّهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ » (الأدب المفرد)

**واتە: (پرسیارکرا لەپێغەمبەری خودا سەلامی خودای لەسەر بێت: چیە ئەو شتەی کە زۆرترین خەڵکی دەباتە بەهەشتەوە؟ ئەویش فەرمووی:(خۆپارێزی لەگوناه + ترسان لە خوا) و ڕەوشت جوانی.**

١٤٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« لاَ يَتناجى اثْنَانِ دُونَ الثَّالِثِ فَإِنَّ ذَلِكَ يُحْزِنُهُ » (الترمذي)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:
ئەگەر سێ کەس بوون بەیەکەوە با دووانتان بەیەکەوە قسەو چرپە نەکەن لەگەڵ یەکترداو ئەوەی تر فەرامۆش بکەن، چونکە ئەمە خەمباری دەکات .

تێبینی //
ئەم فەرموودەیە هەموو ئەو دوو کەسانەش دەگرێتەوە کە بەزمانێکی تر قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن و نایانەوێ دەوروبەریان لێیان حاڵیی بن، لە ڕێگا یان لەمەجلیسدا.

١٤٣. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنْ مُبَشِّرَاتِ النُّبُوَّةِ إِلاَّ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ أَوْ تُرَى لَهُ ». (إبن ماجه)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی:
ئەی خەڵکینە لە موژدەی پێغەمبەرایەتی هیچ نەماوەتەوە تەنها خەون و بینینی ڕاست و دروست نەبێت، کەموسڵمان خۆی دەیبینێت، یان بۆی دەبینن و پێوەی دەبینن .

١٤٤. قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« الْمَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلْ » (احمد)

واتە: خۆشەويست سەلامى خوداى لەسەربێت دەفەرموێ:

مرۆڤ لەسەر ئاينى دۆست وهاورێ وخۆشەويستەكەيەتى، با هەر كەس لەئێوە سەيربكات وبزانێ هاوڕێيەتى گيانى بەگيانى كێ دەكا؟

تێبينى // مرۆڤ ئاسانتر لە هەر كەسێك دەكەوێتە ژێر كاريگەرى خۆشەويستانيەوە بە هەردووبارى چاكى وخراپيەوە، بۆيە خۆشەويستمان وريامان دەكاتەوە لە هەڵبژاردن و لەگەڵ ژيانى دۆست و هاوڕێ و خۆشەويستانمانەوە، چونكە ئەگەر ئەوان چاك و ڕەوشت بەرز و ئايندار بن ئەوا ئێمەش كاريگەر دەكەن بە چاكيى و ڕەوشت بەرزى و ئاينداری خۆيانەوە، خوانەخواستە ئەگەر پێچەوانەبوو ئەوا ئێمەش بە پێچەوانەكانيان كاريگەردەكەن و ئەودەمەش زيانمەندى دونيا و دوارۆژ دەبين.

١٤٥. قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَن تَواضَعَ لِلّهِ رَفَعَهُ اللهُ ». (أحمد و أبونعيم).

واتە: خۆشەويست سەلامى خوداى لەسەر بێت دەفەرموێ:

هەركەس بۆخوا بچووكى بنوێنێ و لەبەرخودا دەروون خاكيانە مامەڵەو هەڵسوكەوت بكات ئەوا خوداى گەورە پلەوپايەى بەرزو بالا دەكات لەناو خەڵكيدا.

١٤٦. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:

« سَبْعَةٌ يُظلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظلّه يَوْمَ لاَ ظلَّ إلاَّ ظلُّهُ: الإمَامُ الْعَادلُ، وَشَابٌّ نَشأَ بعبَادَة اللَّه، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجد،وَرَجُلاَن تَحَابَّا فِي اللَّه اجْتَمَعَا عَلَيْه وَتَفرَّقَا عَلَيْه، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصب وَجَمَال فَقَالَ إنِّي أَخَافُ اللَّهَ، وَرَجُلٌ تَصدَّقَ بصَدَقَة فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ يَمينُهُ مَا تُنْفقُ شمَالُهُ،وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَاليًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ » (مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

لەدوارۆژدا حەوت چین خودا لەژێر سێبەری خۆی کۆیاندەکاتەوە، ئەو ڕۆژەی کەهیچ سێبەرێك نییە جگە لە سێبەری خۆی:

١- پێشەوایەکی دادگەر (عادل).

٢- گەنجێك لەناو بەندایەتی و بەبەندایەتی خوا پێگەیشتبێ.

٣- کەسێك دڵی بەسترابێتەوە بە مزگەوت و پەرستشگاکان.

٤- دووکەس تەنها لەبەر خوا یەکتریان خۆشبوێ، هەرکات کۆببنەوە لەبەر خوا کۆببنەوەو هەرکات دابڕێن لەیەك لەبەر خوا دابڕێن. واتە هەتا ژیانیان لەبەردایە هەرلەبەر خۆشەویستی و ڕەزامەندی خوا هاوڕێیەتی و پێکەوەبوونیان هەبێت و هەتا دەشمرن هەرلەسەر ئەو خۆشەویستییە بمێنن بێ پچڕان و لێکتر تۆران.

٥- پیاوێك:ئافرەتێکی خاوەن پلەوپایەی شۆخ وشەنگ بانگی بکات بۆ زیناو بەدڕەوشتیی وئەویش بڵێت:من لەخوا دەترسم و(نەیکات).

٦- كەسێكى خێرمەندوبەخشەر، وەختێ شتێك ببەخشێ بیشارێتەوە هەتا ئەوەى بەدەستى ڕاستى دەیبەخشێ دەستى چەپى پێى نەزانێ.

٧- هەروەها كەسێك لەچۆلێى ولەتەنهاییدا زیكرویادى خوا بكات و چاوەكانى پڕبن لەفرمێسك وگریان (لەخۆشەویستى وشەرم وترسى خوا).

١٤٧. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« رُبَّ أَشْعَثَ مَدْفُوعٍ بِالأَبْوَابِ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ » (مسلم)

واتە: خۆشەویستمان سەلامى خوداى لەسەر بێت فەرمووى:

دەشێ كەسێك پرچ لوول و تێكئالأوو دەركراوى دەرگاكانیش بێت، كەچى ئەگەر سوێند لەسەرخوا بخوات بۆ جێ بەجێ بوونى شتێك خودا سوێندەكەى ناخات و داواكەى جێ بەجێدەكات.

**تێبینى** // ئەم فەرموودەیە لەناواخنیا ڕێزو قەدرى مرۆڤمان بۆ دیارى دەكات لەلایەن خوداوەو هۆكارەكانى وەرگیرانى دوعاشمان پێ ئاشنا دەكات، ڕێزو قەدرى مرۆڤ بەپەیوەندى گەرم و گەشى دلْ و دەروونیەتى بەخواوەو، گیرابوونى دوعاشى بەكەسابەت و خواردنى ڕزق و ڕۆزى حەلأڵیەتى، (خۆشەویست دەفەرموێ گەردەتەوێ دوعات گیرابێ خواردن و خواردنەوەت چاك وپاك وحەلالْ كە)، ئەو لەبەر كەسابەت وپەیداكرنى ڕزق و ڕۆزى حەلاڵە تۆزاوى و پرچ تێكئالأوەو، لەبەر گرنگى نەدانى بەدونیاو بەخودى خۆشیەتى دەركراوى دەرگاكانە.

١٤٨. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ ». (مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
هەرکەس لەئێوە خراپەو ناپەسەندییەکی بینی با بەدەستی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی بەدەستی بیگۆڕێت با بەزمانی بیگۆڕێت، خۆئەگەر نەیتوانی بەدەستی یان بەزمانی بیگۆڕێت با لەدڵ دا پێی ناخۆشبێت و ئەوەش لاوازترین هەڵوێستی ئیمانییە.

**تێبینی //**

ئەم فەرموودەیە دەکرێت بە دووجۆر لێی تێبگەین:
یەکەمیان: خەڵکانی ئاسایی وەختێ کەخراپەو ناپەسەندییەك دەبینن با لەدڵ دا پێیان ناخۆش بێت کەئەمەش لاوازترین هەڵوێستی ئیمانییەو هی خەڵکە ئاساییەکەیە کە ئەوانیش زۆرینەی کۆمەڵگان و لەوە زیاتریان لەدەست نایەت و ئەگەر بشیانەوێ بەدەست و زمان هەڵوێست بنوێنن و هەوڵی گۆڕاندنی ناپەسەندییەکان بدەن ڕەنگە نەتوانن بەتایبەتمەندیی و حیکمەت وشێوازی خۆی بەرخورد لەگەڵ ڕووداوەکان بکەن و ئەودەمەش ئەو ڕەفتارو گوفتارو هەڵوێستەی کە دەیکەن و دەینوێنن ڕەنگە زیانی زیاتری لێبکەوێتەوەو، بە پێی پەیام

و ڕێنماییە ئیلاهییەکانیش نابێ ڕەفتارو گوفتارێك بکرێن زیانیان زیاتربێ لە سوودیان...

زانایانیش بەهەموو شێوازەکانی گفتوگۆ: بە حیکمەت و، ئامۆژگاری جوان و پەسەندو، دەست خستنەسەر نەخۆشییەکان و، دیاریکردنی ناپەسەندییەکان و، وشیارکردنەوەی خەڵکان لە خراپەکاران و، هەڕەشەکردن لێیان و، هاندانی جەماوەر لێیان بۆ بنبڕکردنی نالەبارییەکان هەوڵدەدەن...

دەسەڵات و یاساو دەسەڵاتدارانیش بەدەستی حوکم و ڕێگرتن لەخراپەکاران و سزادانی تاوانباران بەیاسا، بنبڕی خراپە دەکەن و بەچرای دادو دادگەریی: تاریکایی ستەم ڕادەماڵن.

**دووەمیان:** ئەوەیە هەرکەسێك لەئێوە خراپەو ناپەسەندییەکی بینی با بەڕەوشتی بەرزو کردەوەی لە دڵاشیرین ڕووبەڕووی ناپەسەندییەکە ببێتەوەو هەڵوێستی جوانی خۆی بکاتە بەدیلی خراپەو ناپەسەندییەکەو ئیتر هەنجەتێك بۆ بەردەوامیی خراپەکە نەمێنێت، بۆ نموونە کەسێك گیرۆدەی شەهوەت و ئافرەتە ئەوا ژنی بۆ بهێنرێت و، کەسێك خەریکی دزی و ڕاوەڕووتە پێداویستییەکانی بۆ دابین بکرێت و، کەسێك خەریکی دوژمنکارییە ئاشتەوایی بۆ بکرێت و..هتد.

ئەگەر ئەمانەی نەتوانی با بەزمانی شیرین و بەئەوپەڕی خەمخۆری و ڕێنومایی دڵسۆزانەوە ئامۆژگاری جوان و پەسەند بکات وچارەنووسی کاری دزێو دیاری بکات و چارەسەری دەردو نەهامەتییەکان بکات،

خۆئەگەر ئەوەشی پێنەکرا با بەکوڵی دڵ پێی ناخۆش بێت و لەناخیا دوعا خوازو ئارەزوومەندی گۆڕانی بارودۆخە نالەبارەکە بێت لەلایەن خوداو خەڵکانی دڵسۆزو خەمخۆرو بەهیممەت و حەکیمەوە.

١٤٩. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ كَالَّذِي يَصُومُ النَّهَارَ وَيَقُومُ اللَّيْلَ ». (متفق عليه)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:نمایندەو سەرپەرشتیکارو چاودێرو دابینکاری پێویستییەکان و لەخزمەت بوو و بەهاناوەچووی بێوەژن و هەژار وەك تێکۆشەری ڕێگای خوا وایە، یان وەك ئەوکەسە وایە کە ڕۆژان هەر بەڕۆژوو دەبێت و شەوانیش هەر شەوبێدارە و (شەو نوێژان) دەکات.

١٥٠. أَنَّ أَعْرَابِيًّا قَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ خَيْرُ النَّاسِ؟

قَالَ: « مَنْ طَالَ عُمُرُهُ وَحَسُنَ عَمَلُهُ ». (سنن الترمذي)

واتە: پیاوێکی عەرەبی گوندنشین وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (سەلامی خودای لەسەربێت) کێ چاکترین کەسە؟

خۆشەویستیش فەرمووی: ئەو کەسەی تەمەنی درێژ بێ و ڕەوشتیشی جوان بێت.

١٥١. أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ
« أَيُّ الْإِسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ ». (البخاري)

واتە: پیاوێك لە پێغەمبەری خوای (سەلامی خودای لەسەر بێت) پرسی: چ كردەوەیەكی نێو ئیسلامەتی چاك و باشە؟
خۆشەویست فەرمووی: نان وچێشت وخواردەمەنی بەخەڵك بدەیت و سەلامیش بكەیت لەوانەی دەیانناسیت و نایانناسیت.

١٥٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ الْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ ». (سنن الترمذي) وفي رواية إبن المثنى: « ويسلم الصغير على الكبير ».

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:
با ئەوەی سوارە سەلام لە پیادە بكات و، پیادە سەلام لە دانیشتوو بكات و، ژمارە كەمیش{ كەمینە } سەلام لە ژمارە زۆر{ زۆرینە } بكات و، وە لەریوایەتی ئیبن و موسەنادا ئەم بەشەشی تیادا هەیە كە بچووكیش سەلام لە گەورە بكات.

١٥٣. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا ». (مسلم)

واته: خۆشەويست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

هەرکەس فرت وفێلْ وساختەکاری بکات، ( لەم ڕیوایەتەی ئیمامی موسلیمیشا ) هەرکەس فرت وفێلْ وساختەکاری لەئێمە بکات ئەوا لەسەر ڕێگەو ڕێبازی ئێمە نییە.

**تێبینی //**

هۆکاری دارشتنی ئەم پەیامە پیرۆزو گرنگە بۆ تەواوی مرۆڤایەتی و وتنی ئەم فەرموودە بەنرخ و شیرینە ئەم چیرۆکە بوو:

ڕۆژێکیان خۆشەویستمان بە بازاڕی مەدینەدا گوزەری کردو پیاوێکی بینی گەنمێکی لەڕووکەش جوانی دەفرۆشت، خۆشەویست جوانیی گەنمەکە سەرنجی ڕاکێشاو بەرەو لای کابرا ڕۆیشت و دەستی موبارەکی خستە ناو گەنمەکەو هەستی کرد بەشی ناوەو دواوەی گەنمەکە تەڕەو بارانی بەرکەوتووە، بە تووڕەییەکی گلەیی ئامێزی دڵسۆزانەی شیرینەوە سەری بەرزکردەوەو چاوە ئارامیی بەخشەکانی بڕییە کابرای گەنم فرۆش و پێی فەرموو:

بۆچی گەنمە تەڕەکەت لەلایەك دانەدەناو وشکەکەش لەلایەکی تردا تا هەریەکێکیان بەنرخێك و بەجودا بفرۆشرابایەو موشتەرییەکانیش بیان زانیبایە؟

بەڕاستی هەرکەس فرت و فێڵ و چاوبەستەو ساختەکاری بکات (لە خەڵکان بەگشتی) و لە (لە ئێمەی موسڵمانان بەتایبەتی) ئەوا لەسەر ڕێگەو ڕێبازی ئێمە نییە.

١٥٤. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَنْ كَانَتْ عِنْدَهُ مَظْلَمَةٌ لِأَخِيهِ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهَا فَإِنَّهُ لَيْسَ ثَمَّ دِينَارٌ وَلَا دِرْهَمٌ مِنْ قَبْلِ أَنْ يُؤْخَذَ لِأَخِيهِ مِنْ حَسَنَاتِهِ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ أَخِيهِ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ » (سنن كبرى للبيهقي)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

هەرکەس ستەم ومافخواردنێکی(ماددی یان مەعنەوی) براکەی لەسەرە با تازووە خۆی لێ ڕزگارو گەردەنئازاد بکات چونکە بەڕاستی گۆڕەپانی مەحشەرو دادگای لێپرسینەوەو ڕۆژی دوایی هیچ پارەو پووڵ و سامان و دینارو دیرهەمێکی تیا نیە، با لێرە خۆی لێ ڕزگارو گەردەن ئازادکات بەرلەوەی لەجیاتی ستەم و مافەکان چاکەکانی بەرن بۆ ناو هەگبەو دەفتەری براکەی، یان خوانەخواستە ئەگەر چاکەی نەبوو یان چاکەکانی بەشی قەرەبووکردنەوەی ستەم و مافەکانی نەکرد ئەوا خراپەو گوناهەکانی براکەی بدەن بەکۆڵ داو بەهۆیەوە بچێتە ناو دۆزەخەوە.

١٥٥. أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ:
« الدِّينُ النَّصِيحَةُ » قُلْنَا لِمَنْ قَالَ « لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ ». (مسلم)

واتە: خۆشەویستمان سەلامی خودای لەسەربێت فەرمووی:
ئایین و ئایینداری بریتییە لە دڵسۆزی نواندن و گوێڕایەڵی، یارانی وتیان دڵسۆزی نواندن بۆ کێ؟ خۆشەویست فەرمووی: بۆ خوداو بۆ کیتابەکەی (واتە: بۆ قورئان و ئایین و شەریعەتەکەی) و بۆ پێغەمبەرەکەی و بۆ پێشەواکانی موسڵمانان و هەروەها بۆ سەرجەمی موسڵمانانیش.

## تێبینی//

(النصح) : بریتی یە لەپەرۆشی و خەمخۆری و خۆشەویستی و گوێرایەڵی و دڵسۆزی نواندنێکی ڕاستەقینەی وەها بۆ بەرامبەر کەسەرچاوەکەی لەدڵ و دەروونێکی صاف و ساغ و بێگەردەوە هەڵقولابێت و هیچ جۆرە بەرژەوەندییەکی (ماددی یان مەعنەوی) تێدا نەبێت، بەچەشنێك زووتر لەناخ و دڵ و دەروونا پەرۆشییەکە سەری هەڵدابێت و دواتر بەکردەوە هەمووشتێکی لەپێناودا کرابێت و پاشان بەزمان و ئامۆژگاریش هەتا مردن هەوڵی ڕۆشنکردنەوەی بۆ بدرێت، پێغەمبەران (سەلامی خودایان لەسەربێت) بێ هیچ بەرژەوەندییەکی ماددی و مەعنەوی دڵسۆزانەو خەمخۆرانەو لەناخ و دڵ ودەروونیانەوە

ئارەزوومەنــدی ڕزگــاری و خۆشــبەختی بووینــە بۆگەلــەکانیان و بەکردەوەش ئەم پەرۆشییەیان سەلماندووەو هەتا کۆچی دواییشیان بەردەوام بووینە لەسەر بانگەوازی یەکتاپەرستی و گەیاندنی هەق و ڕۆشــنکردنەوەی پــەیامی خــوداو ئامۆژگــاری کردنــی خــەڵك و دەستنیشان کردنی نەخۆشییەکانیان و چارەسەرییەکان و ڕێگەچارەی سەرفرازییان، بۆیە دروشمی درەخشانی هەموویان بریتی بووە لە:

« أُبَلِّغُكُمْ رِسَالَاتِ رَبِّي وَأَنَا لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ » (الأعراف٦٨)

١٥٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَا لِي وَمَا لِلدُّنْيَا مَا أَنَا فِي الدُّنْيَا إِلَّا كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا » (الترمذي)

خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

نموونەو وێنەی ڕاستەقینەی من لەدونیادا وەك سوارێکە لەژێرسێبەری درەختێکا پشوویەکی کورت بدات و دواتر بڕوات وجێی بهێڵێ.

١٥٧. قَال رَسُولَ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« مَا مِنْ رَجُلٍ يُذْنِبُ ذَنْبًا ثُمَّ يَقُومُ فَيَتَطَهَّرُ ثُمَّ يُصَلِّي ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللّٰهَ إِلَّا غَفَرَ اللّٰهُ لَهُ ». (سنن الماجة)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**
**هەریەکێك گوناه و تاوانێك بکات، پاشان بچێ خۆی بشوات و دەستتنوێژێك بگرێت، یان بەتەنها دەست نوێژێك بگرێت و دوورکات نوێژ بکات و پاشان داوای لێخۆشبوون لەخودا بکات ئیللا خودای گەورە لێی خۆشدەبێت و تاوانەکەی لەسەر دەسڕێتەوە.**

١٥٨. قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« لَا تُظْهِرِ الشَّمَاتَةَ لِأَخِيكَ فَيُعَافِيهِ اللّٰهُ وَيَبْتَلِيكَ » (مسند شهاب)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**
**نە لەدڵدا و نەبەزمان و بەئاشکرا خۆشحاڵ مەبەو خۆشحاڵیی دەرمەبڕە بەشکست و نەهامەتی و کێشەو دەردو بەڵاو نەخۆشی و ناخۆشییەك کەبەسەر براکەتدا هاتووە، چونکە ڕەنگە خودا بەهۆی ئەم هەڵوێست و ڕەوشت و کردارەتەوە (ئەو) لەنەنگیی و شکست و کەموکوڕیی و نەخۆشی و ناخۆشییەکە دەرباز بکات و ئەمجارەیان (تۆ)ی پێ تاقی بکاتەوە.**

١٥٩. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« من صلى علي صلاة واحدة صلى الله عليه عشر صلوات وحطت عنه عشر خطيئات ورفعت له عشر درجات » (النسائي)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:

ئـەو کەسـەی یـەك صـلاوات لەسـەر مـن لـێ بـدات ئـەوا خـودای گـەورە (١٠) صلاوات لەسەر ئەو لێ دەدات.

**تێبینی //**

صـلاواتی ئێمـە بۆپێغەمبـەر سـەلامی خـودای لەسـەر بێـت: داواکردنـی بـەرزو بـەڕێزتر بوونی پلەوپایـەو شـکۆمەندی زیـاتری حـەزرەت گیانـە لـەڕۆژی دواییـدا، صـلاواتی خـوداش بـۆ ئێمـە بەخـشینی ڕەحمـەت و بەرەکەت و لێخۆشبوون و عینایەتی زیاترە لە دونیاو دواڕۆژدا.

١٦٠. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِذَا أَحَبَّ عَبْدِي لِقَائِي أَحْبَبْتُ لِقَاءَهُ وَإِذَا كَرِهَ لِقَائِي كَرِهْتُ لِقَاءَهُ » (مسند إمام أحمد)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی:

خودای بەرز و شکۆمەند دەفەرموێ: ئەگەر بەندەکەم دیـداری منـی پـێ خـۆش بـوو ئـەوا منـیش دیـداری ئـەوم پـێ خـۆش دەبـێ، وەئەگـەر ئـەو دیداری منی پێ ناخۆش بوو ئەوا منیش دیداری ئەوم پێ ناخۆشە.

١٦١. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

قَالَ « أَتَدْرُونَ مَا الْغِيبَةُ ». قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ « ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ ». قِيلَ أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ قَالَ: « إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدِ اغْتَبْتَهُ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ فَقَدْ بَهَتَّهُ » (مسلم) .

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت لە یارانی دەوروبەری خۆی پرسی: ئایا دەزانن (غەیبەت چیە؟)، ئەوانیش وتیان خوداو پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن، فەرمووی: باسکردنی برا (ئیمانی وئینسانی) یەکەتە بەجۆرێك کەپێی ناخۆش بێت، یەکێك پێی وت: ئەی ئەگەر ئەوشتەی دەیڵێم لەبراکەمدا هەبوو؟ فەرمووی: ئەگەر ئەو شتەی دەیڵێی لەبراکەتدا هەبوو ئەوا غەیبەتت کردووە، خۆ ئەگەر تیایدا نەبوو ئەوا بوختانت پێی کردووە.

١٦٢. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ » (مسلم)

خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەیە کەخۆشی دەوێت.

**بەواتە//** چۆن لەدونیا خۆشەویستان لەسەر ڕەوشت و هەڵوێست و بیرکردنەوەو ئایینی یەکتردەبن، ئەوهاش لە قیامەت لەگەڵ یەکتردا حەشر دەکرێن.

١٦٣. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدٍ خَيْرًا اسْتَعْمَلَهُ فَقِيلَ كَيْفَ يَسْتَعْمِلُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ يُوَفِّقُهُ لِعَمَلٍ صَالِحٍ قَبْلَ الْمَوْتِ » (سنن الترمذي)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

ئەگەر خودا خەیری بۆ یەكێك بوێت بەكاری دەهێنێت و دەیخاتەسەر ڕێگای ڕاستەقینەو بەگەڕی دەخات، وتیان چۆن بەكاری دەهێنێت ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بەر لەمردنی هاوكاری و پاڵپشتی و كارسازیی بۆ دەكات لەسەر كردەوەیەكی چاك و شیاو.

١٦٤. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصِّيَامِ وَالصَّلاَةِ وَالصَّدَقَةِ؟ ».قَالُوا بَلَى، قَالَ: « إِصْلاَحُ ذَاتِ الْبَيْنِ وَفَسَادُ ذَاتِ الْبَيْنِ الْحَالِقَةُ ». (سنن أبي داود)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی:

ئایا شتێكتان پێ بڵێم باشترو بەرزو بەڕێزتر بێت لە پلەوپایەی نوێژو ڕۆژوو و بەخشین؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: چاككردنی ناخۆشیی نێوان خەڵكی، بە پێچەوانەشەوە تێكدانی نێوانی خەڵكی تراشەرە (واتە: تراشەری كردەوە چاكە تۆماركراوەكان و تراشەری ڕەوشتە جوانەكانیشە لەكەسایەتی مرۆڤی موسڵماندا).

١٦٥ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ ».
(السنن الصغرى).

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:
خودای گەورە ئوممەتەکەمی بووریوە لەو کردەوانەی کە بەهەڵە ئەنجام دەدرێن و نیازی دڵیان لەگەڵ نییەو نایزانن کە هەڵەیە، هەروەها ئەوشتانەش کە بەهۆی لەبیرچوونەوەوە دەفەوتێن و ئەنجام نادرێن، وە هەروەها ئەوکردەوە خراپانەش کە بەزۆرداری وستەم و ناچارییەوە پێیان ئەنجام دەدرێت

١٦٦ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« مَا آمَنَ بِي مَنْ بَاتَ شَبْعَانًا وَجَارُهُ جَائِعٌ إِلَى جَنْبِهِ وَهُوَ يَعْلَمُ بِهِ»
(ادب المفرد للبخاري)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
باوەڕی تەواوو ڕاستەقینەی بەمن نەهێناوە ئەوکەسەی تێرەو ( بەتێری ژیان بەسەر دەبات ) و دراوسێکەشی لەتەنیشتیەوە برسیەو (بەبرسیەتی ژیان دەگوزەرێنی)و ئەویش ئاگادارە بەحاڵ و گوزەرانی.

١٦٧. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« عَلَيْكُمْ بالصِّدْق فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدى إِلَى الْبرِّ وَإِنَّ الْبرَّ يَهْدى إِلَى الْجَنَّة وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عنْدَ اللَّه صدِّيقًا وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذبَ فَإِنَّ الْكَذبَ يَهْدى إِلَى الْفُجُورِ وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدى إِلَى النَّارِ وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذبَ حَتَّى يُكْتَبَ عنْدَ اللَّه كَذَّابًا». (مسلم)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
ورياتان دەكەمەوە، ئامۆژگارييتان دەكەم، پێتان ڕادەگەینم كە زۆر گرنگی بدەن بەڕاستی و ڕاستگۆیی و ڕاستكاریی و ڕاست ژینی، چونكە بێگومان و بەدڵنیایەوە ڕاست ژینیی لە ڕەفتارو گوفتاردا خاوەنەكەی ڕێنوێنی دەكات بۆ چاكیی و چاكەكاری، وە بێگومان وبەدڵنیایشەوە چاكیی و چاكەكاری خاوەنەكەی ڕێنوێنی دەكات بەرەو بەهەشت، ئیتر مرۆڤ بەردەوام بەڕاستی دەژێیت و بەڕاستی گوفتارو ڕەفتار دەكات هەتا وای لێدێت لەلای خودا ناوی بەڕاستگۆی ڕاستەقینە تۆمار دەكرێت...
هەروەها ئامۆژگارییتان دەكەم و پێتان ڕادەگەینم كە زۆر وریای درۆ و درۆكاری و بەدرۆ ژینیی بن، چونكە بێگومان و بەدڵنیاییەوە درۆكاری لەڕەفتارو گوفتاردا خاوەنەكەی ڕێنوێنی دەكات بەرەو خراپەو خراپەكاری و لەسنوور دەرچوون، خراپەو خراپەكاریش ڕێنوێنی دەكات بەرەو دۆزەخ، ئیتر مرۆڤ بەدرۆكاری بژێیت و هەموو تەمەن لەسەریشی بەردەوام بێت وای لێدێت لەلای خودا ناوی بەدرۆزنی ڕاستەقینە تۆماردەكرێت.

١٦٨. أَنَّ رَسُولُ اللّه صَلَّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ قَالَ:عَادَ رَجُلاً منَ الْمُسْلمينَ قَدْ خَفَتَ فَصَارَ مثْلَ الْفَرْخِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللّه صَلَّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ « هَلْ كُنْتَ تَدْعُو بِشَيْءٍ أَوْ تَسْأَلُهُ إِيَّاهُ؟». قَالَ نَعَمْ كُنْتُ أَقُولُ اللّهُمَّ مَا كُنْتَ مُعَاقِبِي بِهِ فِي الآخِرَة فَعَجِّلْهُ لِي فِي الدُّنْيَا. فَقَالَ رَسُولُ اللّه صَلَّى اللّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ « سُبْحَانَ اللّه لاَ تُطِيقُهُ - أَفَلاَ قُلْتَ اللّهُمَّ آتنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ». قَالَ فَدَعَا اللّهَ لَهُ فَشَفَاهُ (مسلم)

واتە: خۆشەویستمان سەلامی خودای لەسەربێت سەردانی پیاوێکی نەخۆشی کرد لەموسڵمانان، وردە وردە ئەوەندە بچووك و لاواز ببۆوە هەرئەوەندەی فەرخە باڵندەیەکی لێ مابوویەوە، خۆشەویست پێی فەرموو: ئایا تۆ هیچ دوعایەکت لەخوا نەکردووە لەخۆت؟ یان داوای شتێکت لێ نەکردووە کەبۆت جێبەجێ بکات؟ پیاوەکە وتی: بەڵێ، بەردەوام دەموت و وتوومە: خوایەگیان هەموو ئەو سزایانەی کەبۆت داناوم لەدوارۆژدا بۆم پێشوەخت بکە و لەدونیادا سزاکەم لێ وەرگرەوە ، خۆشەویستمان فەرمووی: پاکی و بێ گەردی بۆ خوا ، دڵنیابە ناتوانی و بەرگەی سزای خوا ناگری، ئەی بۆچی نەت دەوت:

(اللّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)

واتە: خوایەگیان لەدونیا چاکترین شتمان پێ ببەخشەو لەدوا ڕۆژیشدا چاکترین شت وبەشمان پێ خەلاَت بکەو لەئاگری دۆزەخیش بمانپارێزە، ئیتر خۆشەویست لەخوداوە دوعای شیفای بۆ کردو خواگیانیش شیفایدا.

١٦٩. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« الْمُؤْمِنُ الْقَوِىُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ، وَفِى كُلٍّ خَيْرٌ، أحْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَلاَ تَعْجِزْ، وَإِنْ أَصَابَكَ شَىْءٌ فَلاَ تَقُلْ لَوْ أَنِّى فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا. وَلَكِنْ قُلْ قَدَّرَ اللَّهُ وَمَا شَاءَ فَعَلَ فَإِنَّ {لَوْ} تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ ». (مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
باوەڕداری بەهێز باشترو خۆشەویست ترە لە لای خودا لە باوەڕداری بێ هێزو لاواز، لەهەرکامێکیشیان هەر خێر هەیە، سووربە و دەست و دڵ بگرە بەوشتەی کەمایەی سوودمەندییە بۆت، پشت بەخوا ببەستەو داوای یارمەتی لێ بکەو تەواوی ئەو هۆکارانە بگرەبەر کەمایەی سەرکەوتنی کارەکانتە، خۆت دەست بەستراوو پەککەوتەو گیرۆمەند مەکە، دوای دەست گرتنت بەهۆکارەکان و دڵ پەیوەست کردنت بەخودا ئەگەر شتێکی ناخۆش و نابەردڵت تووش هات ئەوا مەڵێ ئەگەر بێت و ئەوەو ئەوەم بکردبایە ئەنجامەکە وانەدەبوو، بەڵکو بڵێ خواگیان ئەندازەگیری و تەقدیری وەهاکردووەو ئەوەی ویستی کردی، چونکە بێ گومان و بەدڵنیاییەوە وشەی(ئەگەر) دەرگای کردەوەی شەیتان دەکاتەوە.

١٧٠. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« لاَ أَعُدُّهُ كَاذِبًا الرَّجُلُ يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ يَقُولُ الْقَوْلَ وَلاَ يُرِيدُ به إلاَّ الإِصْلاَحَ وَالرَّجُلُ يَقُولُ فِي الْحَرْبِ وَالرَّجُلُ يُحَدِّثُ امْرَأَتَهُ وَالْمَرْأَةُ تُحَدِّثُ زَوْجَهَا ».
(سنن أبي داود)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرمویٚ:
لەڕیزی درۆزنانی ناژمێرم {واتە: بەدرۆی بۆحیساب ناکەم } ئەوکەسەی بۆچاککردنی ناخۆشیی نێوان خەڵکی قسەی ناڕاستی دڵ نەرمکەرو بەرژەوەندیدار لەلای هەریەکێکیان دەکات و تەنها مەبەستیشی پێی چاککردنی نێوانیانە، ئەوکەسەش کە قسەو دەربڕینی ناڕاست لەشەڕی موسڵمانان دژ بەناموسڵمانان دەکات و مەبەستیشی پێی تەنها سەرخستنی پەیامی ئیسلام و موسڵمانانە، هەروەها ئەو پیاوو ئافرەتە هاوسەردارەش کە قسەوباس و پێناسەی ناڕاستی دەروونیان بۆ یەکتر دەردەبڕن و مەبەستیشیان پێی تەنها زیادکردنی خۆشەویستی هەریەکێکیانە لە دڵی ئەوەی تردا.

١٧١. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:« مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ إِلَّا غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا ». (سنن الترمذي)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێت:
هەرکات دوو موسڵمان بگەنە یەکتری و { بەدڵ } تەوقە لەگەڵ یەکتری بکەن ئیللا خودای گەورە لێیان خۆشدەبێت پێش ئەوەی لەیەکتر جودا ببنەوە).

١٧٢. عن أبي هريرة رضي الله عنه: عن النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قال:« مَن لَم يَرحَم صَغِيرَنَا ويَعرف حَق كَبيرِنا فَليس مِنَّا »
(أبي داود)

واتە: لە ئەبو هورەیرەوە گێڕدراوەتەوە، خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت فەرموویەتی: لەسەر ڕێچکەو ڕێبازی ئێمە (ئیسلامەتی) نییە ئەوکەسەی سۆزو میهرەبانی و ڕەحم بەبچووکەکانمان نەکات و، هەروەها قەدرو ڕێزی گەورەکانمانی لەلا نەبێ.

١٧٣. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« عَائِدُ الْمَرِيضِ فِي مَخْرَفَةِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَرْجِعَ ». (مسلم)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

سەردانیکەری نەخۆش بەردەوام لەناو باخ و ڕەزو لەچنینەوەی بەروبوومی بەهەشتایە تا دەگەڕێتەوە.

بەواتە//

ئەوکەسەی سەردانی نەخۆشێك دەکات بەردەوام خێرو پاداشتی بۆدەنووسرێت و وەك ئەوە وایە بەهۆیەوە خودا لێی ڕازی بێت و بچێتە بەهەشتەوەو لەناویا بەروبوومی درەختەکانی بچنێتەوە.

١٧٤ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« يَهْرَمُ ابْنُ آدَمَ وَيَشبُّ منْهُ اثْنَتَان الْحرْصُ عَلَى الْمَالِ وَالْحرْصُ عَلَى الْعُمُرِ » (مسلم)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

ئادەمیزاد پیردەبێت و دوو شتیش لەودا هەمیشە گەنج دەبێت و (بەگەنجیش دەمێنێتەوە): چلێسی و ڕژدی و ئارەزووکردن و سووربوونی لەسەر تەمەن و، ماڵ و سامان.

١٧٥ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« انْصُرْ أَخَاكَ ظَالمًا أَوْ مَظْلُومًا فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّه أَنْصُرُهُ إِذَا كَانَ مَظْلُومًا أَفَرَأَيْتَ إِذَا كَانَ ظَالمًا كَيْفَ أَنْصُرُهُ قَالَ تَمْنَعُهُ منْ الظُّلْمِ فَإِنَّ ذَلكَ نَصْرُهُ ». (البخاري)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:

براکەت سەرخە ئەگەر ستەمکاربوو یا ستەم لێکراو، پیاوێك گوتی ئەی پێغەمبەری خوا (سەلامی خودای لەسەربێت) سەری دەخەم ئەگەر ستەم لێکراوبوو، بەڵام ئەگەر بینرا ستەمکارەو وا ستەم دەکات چۆن سەری بخەم؟ فەرمووی: ڕێگیری لێ بکەو مەهێڵە لەسەر ستەمەکەی بەردەوام بێت، ئا ئەوە سەرخستنیەتی.

١٧٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ وَمَا زَادَ اللَّهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إِلاَّعِزًّا وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلَّهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ ». (مسلم)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**هەرگیز بەخشین لەسەروەت وسامان کەم ناکاتەوە، بۆ بەندەیەکیش کەببووریٚ لەبەرامبەرەکانی ئەوا خودا تەنها عیززەت و سەربەرزی و شکۆمەندی بۆ زیاد دەکات، هەر کەسێکیش لەبەرخودا خاکیی بێت و خۆی بچووك بنوێنێ و بێ نەفسیی ئەنجام بدات ئیللا خودای گەورە پلەوپایەی بەرز دەکاتەوە هەم لای خۆی و هەم لای بەندەکانی.**

١٧٧. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ كَمْ نَعْفُو عَنِ الْخَادِمِ؟ فَصَمَتَ ثُمَّ أَعَادَ عَلَيْهِ الْكَلاَمَ فَصَمَتَ فَلَمَّا كَانَ فِي الثَّالِثَةِ قَالَ:« اعْفُوا عَنْهُ فِي كُلِّ يَوْمٍ سَبْعِينَ مَرَّةً »

(أبي داود)

**(واته: پیاوێك هاتە لای خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت و پێی وت: ئەی پێغەمبەری خودا چەندجار لە(خزمەتکارو شاگردو بەردەستەکانی خۆمان) ببوورین؟ خۆشەویست بێدەنگ بوو، کابرا بۆ جاری دووەم پرسیارەکەی لێ دووبارە کردەوە، هەمدیسان خۆشەویست بێدەنگ بوو، لەجاری سێهەم دا کە پرسیارەکەی سێ بارە کردەوە پێغەمبەر سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی: لەهەموو ڕۆژێکدا (٧٠) جار لێی ببوورن (لەسەر کەموکوڕییەکانی).**

١٧٨. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ بِجَلاَلِي الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلِّي ». (مسلم)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
خودای گەورە لە دواڕۆژا دەفەرموێ: کوان ئەوانەی تەنها لەبەر خاترو ڕەزامەنـدی و شـکۆمەندی مـن یـەکتریان خۆشویـستووە؟ چـونکە ئەمڕۆ(بەهۆی ئەم یـەکتر خۆشویـستنەیانەوە) دەیانخەمـە ژێر سـێبەری خۆم لەڕۆژێکا کەهیچ سێبەرێکی ترنییە جگە لەسێبەری خۆم.

١٧٩. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَحَبِّكُمْ إِلَيَّ وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ فَسَكَتَ الْقَوْمُ، فَأَعَادَهَا مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا قَالَ الْقَوْمُ نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ أَحْسَنُكُمْ خُلُقًا ». (مسند أحمد)

واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
ئایـا هـەواڵتان بـدەمێ بـە خۆشەویـستترین و نـزیکترین کەسـتان لەهاوڕێیەتی ومەجالیسم لـەڕۆژی دواییـدا؟(سـێ جار ئەمـەی فـەرموو)، هـاوەڵان وتیـان بـەڵێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا (سەلامی خودای لەسەربێت)، فەرمووی: ئەو کەسەتان کە زۆر ڕەوشت جوان وچاکە.

١٨٠. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« مَثَلُ الْمُؤمنِ من أَهلِ الإيمانِ مثلُ الرَّأسِ منَ الجَسَد، يَألَمُ ممَّا يُصيبُ أَهلُ الإيمانِ كَمَا يَألَمُ الرَّأسُ ممَّا يُصيبُ الجَسَدُ ». (معجم الأوسط)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**نموونەی باوەڕدار لەناو کۆمەڵی ئیمانداراندا وەکو نموونەی سەری مرۆڤە لەجەستەدا، مرۆڤی باوەڕدار ئازار دەچێژێ و بەشداردەبێت لەو ئازارەی کەتووشی کۆمەڵی ئیمانداران دێت لە هەرکوێیەك کەهەبێت، وەکو چۆن سەر ئازاری پێدەگات و بەشداردەبێت لەو ئازارەی کەتووشی جەستە دەبێت لەهەربەش و پارچەیەکی بێت.**

١٨١. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« وَإِنِ امْرُؤٌ شَتَمَكَ وَعَيَّرَكَ بِمَا يَعْلَمُ فِيكَ فَلاَ تُعَيِّرْهُ بِمَا تَعْلَمُ فِيهِ فَإِنَّمَا وَبَالُ ذَلِكَ عَلَيْهِ ». (شعب الايمان)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**ئەگەر کەسێك جوێن و قسەی ناشیرینی پێ وتی و عەیبداری کردی بەشتێك کەدەیزانی لەتۆداو تێتدا هەبوو ئەوا تۆ هەرگیز عەیبداری مەکە بەشتێك کە دەیزانی لەئەودا، بێگومان سزای تاوانەکە کە ( جوێن دان و عەیبدارکردنی خەڵکی و نەپاراستنی نهێنی ڕەوشت و ئاکاری برایەکانە ) بەئەستۆی ئەوە.**

١٨٢ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« إِنَّ ممَّا أَدْرَكَ النَّاسُ منْ كَلامِ النُّبُوَّةِ الأُولَى إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شئْتَ » (المعجم الكبير للطبراني)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**
**ئەوەی کە خەڵکان پێی گەیشتبن و پێیان گەیشتبێ و بۆیان مابێتەوە لە وتەو حیکمەت و پەیامی پێغەمبەرانی پێشوو(سەلامی خوایان لەسەربێت) ئەوەیە کە: ئەگەر شەرم وشکۆ ناکەی و خاوەن ڕەوشتی شەرمەندەیی نیت ئەوا چی دەکەیت بیکە.**
**بەواتا// شەرم وشکۆ پەیامی هەموو پێغەمبەران بووەو بەوپەڕی پەرۆشییەوە بەشوێنکەوتەکانیان ڕاگەیاندووە کەشەرم وشکۆکردن لەخودا بەربەست و پارێزەری ڕاستەقینەی مرۆڤەکانە لەگوناه و تاوان و سەرپێچی و سنوور بەزێنییەکان.**

١٨٣ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« أَيُّهَا النَّاسُ كُونُوا أَبْنَاء الآخرَةِ، وَلا تَكُونُوا أَبْنَاء الدُّنْيَا، فَإِنَّ كُلَّ أُمٍّ يَتْبَعُهَا وَلَدُهَا » (المعجم الكبير للطبراني)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**
**ئەی خەڵکینە: ببنە ڕۆڵەو نەوەی دواڕۆژ، مەبنە ڕۆڵەو نەوەی دونیا، چونکە بێگومان و زۆر بەدڵنیاییەوە هەموو دایکێك ڕۆڵەکەی ڕێی ئەو دەگرێت و بەدوای ئەودا هەنگاو دەنێت.**

١٨٤ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« إنَّ للهِ آنية من أَهلِ الأَرضِ، وآنيةُ رَبِّكُم قُلُوبُ عباده الصَّالحين، وأَحَبُّها إِليه أَلينُها وأَرَقُّها » (مسند الشاميين)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**بەراستی خودا دەفرێکی هەیە لەئەهل و کۆمەڵی سەر زەوی، دەفرەکەی پەروەردگاریشتان دڵی بەندە چاك وپاك وصاڵحەکانیەتی، وە خۆشەویسترینی ئەو دڵانەش لەلای خودا ئەو دڵەیانە کە نەرم ونیانترین و ناسکترین و میهرەبانترینیانە.**

١٨٥ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّم:
«خُلُقان يُحبُّهُما الله وَخُلُقان يُبغضهُما الله. فأمَّا اللّذان يُحبُّهُما الله: فالسَّخاء وَالسَّماحة، وأمَّا اللَّذان يُبغضهُما الله: فَسوء الخُلُقِ وَ البُخل، وَإذا أَرادَ اللهُ بِعَبد خيراً استَعمَلَهُ عَلى قَضاء حوائِجِ النَّاسِ »(شعب الايمان)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**دوو ڕەوشت هەن خودا خۆشیانی دەوێت و دوو ڕەوشتیش هەن خودا ڕقی لێیان دەبێتەوە، ئەو دوو ڕەوشتەی کەخودا خۆشیانی دەوێت بریتین لە: سەخاوەت و دەستکراوەیی لەگەڵ نەرم و نیانیی و لێبوردەیی، ئەو دووانەش کەخودا ڕقی لێیان دەبێتەوە بریتین لە: ڕەوشت نزمیی و ئاکارناشیرینی لەگەڵ ڕەزیلی و چرووکی و دەست نوقاویی.**

١٨٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« حُوسِبَ رجلٌ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُم ، فَلم يُوجَد لَهُ من الخَيرِ إلا أنَّهُ كَانَ رَجُلًا يُخَالِطُ النَّاسَ ، وكانَ مُوسِراً فَكَان يَأمُرُ غلمَانَهُ أَن يَتَجَاوزُوا عَن المُعْسِرِ، قال الله عز وجل: فَنَحنُ أَحَقُ بِذلكَ منهُ ، فَتَجَاوزُوا عَنْهُ » (الادب المفرد)

**خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**پیاوێك لە میللەتانی پێش ئێوە هەق و حیسابی لەگەڵ کراو هیچ خێرو چاکەیەك لەکارنامەی ژیانیدا نەبینرا، تەنها ئەوە نەبێ کەپیاوێك بوو تێکەڵیی خەڵکی دەکردو لەمامەڵەکردن لەگەڵیاندا ئاسانکارو مۆڵەتدەربوو، هەمیشە فەرمانی بە کوڕو خزمەتگوزارەکانی دەکرد کە چاوپۆشی بکەن لەو قەرزارانەی باری ژیان و گوزەرانیان سەخت و دژوارەو مۆڵەتی درێژخایەنیان پێ بدەن یان بۆیان کەم بکەنەوە یان لێیان خۆشبن، خودای بەرزو شکۆمەندیش فەرمووی ئێمە شایەنترین بەوەی کە چاوپۆشی و لێخۆشبوون بکەین، چاوپۆشی لەگوناهەکانی کردو لێی خۆشبوو.**

١٨٧. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ. فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ » (سنن النسائى).

**واتە: خۆشەویستمان سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**خۆتان لەئاگری دۆزەخ بپارێزن و دوورخەنەوە ئەگەر بە بەخشینی لەتە خورمایەکیش بێت ، ئەگەر بۆتان نەڕەخسا ئەوا بە (وشەیەك یان ڕستەیەك یان قسەو باسێك) ی خۆش و باش بیکەن.**

١٨٨ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:
« إِذَا نَظَرَ أَحَدُكُمْ إِلَى مَنْ فُضِّلَ عَلَيْه فِي الْمَالِ وَالْخَلْقِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ منْهُ ممَّنْ فُضِّلَ عَلَيْه ». (مسلم)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرمویٚ:**

**ئەگـەر یـەكێك لـەئێوە سـەروەت وسـامان وجەسـتەو جـوانیی كەسـێك سەرنجی ڕاكێشا كە دەوڵەمەندتربوو لە ئەو( لە ڕووی موڵك و ماڵ )ەوە و ڕێك وپێك تربوو لە ئەو( لەڕووی خیلقەتەوە ) ئەوا با تەماشای ژیـان وگوزەرانی كەسێك بكات كەلەخۆی هەژارترەو سەیری جەستەو شێوەو ڕووخساری یەكێك بكات كەلەخۆی لەخوارترە.**

**تێبینی //**

**ئەم فەرموودەیە حاڵییمان دەكات كەلەكاروباری دونیاو ژیـان تەماشای كەسانی نزمتر لەخَۆمان بكەین تا تووشـی حەسـادەت و ڕق و كین نێین و، بۆ ئیمان و ئاكاری بەرزو خووڕەوشتی جوانیش تەماشای مرۆڤانی چـاكتر لـەخۆمان بكـەین لـەڕووی بـاوەڕی گـەرم و گـەش و دامـەزراو و ئاكـاری جوامێرانـەو ئـەخلاقیاتی بـەرزو بـەڕێزەوە بۆئـەوەی هەمیـشە گـوڕوتین بكەوێتـە دەروونمـان و تـەكانی گـەرم و گەشـتر بـەدڵ و گیـانی خۆمـان بـدەین بـۆ دامـەزراوتربوونی باوەڕمـان وجوانتربـوونی ئاكـارو خووڕەوشتمان.**

١٨٩.قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ في حجة الوداع: « ألا أُخبرُكُم بِالْمُؤمِنِ؟ مَن أَمِنَهُ النَّاسُ عَلى أَموالِهِم وَأَنفُسِهِم، وَالْمُسلِمُ: مَن سَلِمَ النَّاسُ مِن لِسانِهِ وَ يَدِهِ، وَالْمُجاهِدُ: مَن جَاهَدَ نَفسَهُ فِي طاعَةِ اللهِ، وَالْمُهاجِرُ: مَن هَجَرَ الخَطايا وَالذُّنوب » (شعب الإيمان)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**ئایا هەواڵتان بدەمێ و مرۆڤی ئیماندارتان پێ بناسێنم؟ ئەوکەسەیە کەهەموو خەڵکی لە ماڵ و گیانیان لێی ئەمین وپارێزراوبن، موسڵمانیش ئەوکەسەیە کەهەموو خەڵکی لەدەست و زمانی پارێزراوبن، موجاهیدو تێکۆشەریش ئەو کەسەیە کەدڵ ودەروون و جەستەی خۆی ڕادەهێنێ لەفەرمان بەرداری خوداو بەندایەتی کردنی داو هەمیشە ململانێ لەگەڵ نەفسی خۆی دەکات بۆ ملکەچ بوونی لەئاست فەرمانەکانی خواو جێ بەجێ کردنیان دا، موهاجیرو کۆچکەریش ئەو کەسەیە کەپشت لەگوناه و تاوانان دەکات و بەجێیان دەهێڵێ.**

١٩٠. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي نَفْسِكَ وَكَرِهْتَ أنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ»

(مسلم)

**واته: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرموێ:**

**چاکە بریتی یە لە ڕەوشت جوانی، خراپەش بریتی یە لەکردنی کارێك دڵە خورپەت بۆ دروست بکات و حەزیش نەکەی کەس پێی بزانێ، یان لەکاتی ئەنجام دانیا بتبینن.**

١٩١ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:

« إِيّاكُم وَ الدَّينَ فَإِنَّهُ هَمّ بِاللَّيْلِ وَ مُذلَّة بِالنَّهارِ » (شعب الإيمان)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**زۆر وریای قەرزباری بن، چونکە بێگومان قەرزباریی مایەی خەم و خەفەتە لەشەوداو هەروەها هۆکاری شەرمەزاریشە لەڕۆژدا.**

**تێبینی // ئەم فەرموودەیە باسی قەرزاربوونێك دەکات کەمرۆڤ بەدەستی خۆی و ناحەکیمی لەکارو کەسابەتدا خۆی تووشی زەرەری گەورە بکات و ئاسان نەتوانێت لەژێریدا بێتەدەرێ، بۆیە وریامان دەکاتەوە کە هەم بەقەد دەسمایەی خۆمان کارو کەسابەت بکەین و هەمیش پشت بەخوا بەکارزانی و وریاییەوە هەنگاوی بۆ بنێین.**

١٩٢ قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:

« أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ فَمَنْ تُوُفِّي وَعَلَيْه دَيْنٌ فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَهُوَ لِوَرَثَته ». (مسلم)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**ئەمن لەپێشترو خەمخۆرترو دڵسۆزترم بۆ بڕواداران لەخودی خۆشیان بۆ خۆیان، هەر باوەڕدارێك مردو قەرزی لەسەربوو ئەوا قەرزدانەوەکەی لەسەر من، وەئەگەر موڵك و ماڵ و سامانیشی لەدوای خۆی جێهێشتوو ئەوا بۆ واریسەکانیەتی.**

١٩٣. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:

« إِنَّ الْغَضَبَ جَمْرَةٌ تُوقَدُ فِي جَوْف ابْنِ آدَمَ أَلَا تَرَوْنَ إِلَى حُمْرَة عَيْنَيْه وَانْتفَاخِ أَوْدَاجه فَإِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ شَيْئًا منْ ذَلكَ فَالْأَرْضَ الْأَرْضَ، أَلَا إِنَّ خَيْرَ الرِّجَالِ مَنْ كَانَ بَطِيءَ الْغَضَبِ سَرِيعَ الرِّضَا وَشَرَّ الرِّجَالِ مَنْ كَانَ سَرِيعَ الْغَضَبِ بَطِيءَ الرِّضَا». (أحمد)

**خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**بەڕاستی تووڕەیی پشکۆیەکی ئاگرینەو لەدەروونی ئادەمیزاد دادەگیرسێ، ئایا سووربوونەوەی چاوەکانی و ئاوسانی ڕەگ و شادەمارەکانی ملی نابینن؟ ئەگەر هەریەکێك لەئێوە تووڕەبوو و ئەوحاڵەتەی لەخۆیدا بینی با ڕوومەتەکان و نێوچەوانی لەسەرخۆڵ و زەوی دابنێت، بەڕاستی باشترینی خەڵکان ئەوەیانە درەنگ تووڕە دەبێت و زوو ئاشت دەبێتەوە، وە خراپترینی مرۆڤانیش ئەوەیانە کە زوو تووڕە دەبێت و درەنگ ئاشت دەبێتەوە.**

١٩٤. قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْه وَسَلَّمَ:

« إِذَا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ الْمُؤْمنَ قَدْ أُعْطِيَ زُهْدًا فِي الدُّنْيَا وَقِلَّةَ مَنْطِقٍ فَاقْتَرِبُوا مِنْهُ فَإِنَّهُ تَلَقَّى الْحِكْمَةَ » (معجم الكبير للطبراني)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**ئەگەر باوەڕدارێکتان بینی دونیا بەکەم گریی و کەمدوویی پێ بەخشرابوو ئەوا لێی نزیك بکەونەوە چونکە بێ هیچ گومانێك ئەوکەسە ژیریی و کارزانیی و حیکمەت و دانایی وەرگرتووە.**

١٩٥. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« إِنَّ اللَّهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى أَجْسَادِكُمْ وَلاَ إِلَى صُوَرِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ ».
وَأَشَارَ بِأَصَابِعِهِ إِلَى صَدْرِهِ ». (مسلم)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت فەرمووی:**
**(لە بایەخ پێدانا) خودا تەماشای جەستەو شێوەو رووخسارتان ناکات، بەڵکو تەماشای دڵەکانتان دەکات، (بە پەنجە موبارەکەکانی ئاماژەی بۆ سینەو دەروونی خۆی کرد).**

**تێبینی // ئەم فەرموودەیە حاڵییمان دەکات کە ڕەنگ و زمان و گەل و نەتەوە دەست نیشانی بەرزیی و نزمی، ڕێزداری و بێ ڕێزی مرۆڤەکان ناکات، بەڵکو دڵی سازگارو پەیوەست بوونی گەرم و گەشی بەخواوە پلەوپایەی خاوەنەکەی لەلای خوا دەست نیشان دەکات، بۆیە هەرخۆی دەفەرموێت:** (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ) (الحجرات ١٣)
**واتە: بەڕێز ترینتان لەلای خودا لەخوا ترس ترین وخۆپارێزترینتانە.**

١٩٦. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« مَا كَانَ الْفُحْشُ فِي شَيْءٍ إِلَّا شَانَهُ وَمَا كَانَ الْحَيَاءُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ».
(سنن الترمذي)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**
**بیگومان دەمشڕیی و بێ ئابڕوویی و هەرزەیی و بێ شەرمیی لەهەرشتێکا بێت ئیللا ناشیرینی دەکات و شەرم و شکۆو سەنگینییش لەهەرشتێکا بێت ئیللا جوانی دەکات.**

١٩٧. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

« اسْتَعِينُوا عَلَى إِنْجَاحِ حَوَائِجِكُمْ بِالْكِتْمَانِ ، فَإِنَّ كُلَّ ذِي نِعْمَةٍ مَحْسُودٌ ».

(المعجم الكبير للطبراني)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**بۆ دەستکەوتنی پێداویستی و سەرکەوتنی کاروبارەکانتان کۆمەك لەنهێنیکاریی وەرگرن و پشت بەشاردنەوەی ڕێ و شوێن و وردودرشتی کاروبارەکانتان ببەستن، چونکە بەڕاستی هەموو خاوەن نیعمەت وبەخششێك حەسوودی پێبراوەو ئیرەیی پێ دەبردرێت.**

١٩٨. أنَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:

لقي أبا ذَر فَقالَ: يا أَبا ذَر أَلا أَدُلُّكَ عَلى خَصلَتَينِ هُما أَخَفُّ عَلى الظَّهرِ وَ أَثقَلُ فِي الميزانِ من غَيرِهما ؟قَالَ: بَلى يا رَسُولُ اللَّه، قال: (طُولُ الصَّمتِ وَ حُسنُ الخُلُقِ) وَالّذي نَفسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ مَا عَمِلَ الخَلائقُ بِمثلِهِما) (شعب الإيمان)

**واتە: پێغەمبەری خوا (سەلامی خودای لەسەربێت) گەیشت بە ئەبو زەر و پێی فەرموو: ئەی ئەبو زەر ئایا دوو ئاکارو خەسڵەتت نیشان نەدەم کە زۆر سووکن لەهەڵگرتنیان {واتە لە ئەنجام دانیان }و زۆر گران و سەنگینیشن بۆ سەر تەرازوو {لەڕۆژی دوایی دا ؟} ئەبو زەر وتی بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بێ دەنگی درێژخایەن و ڕەوشت جوانی، سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە هەموو ژینلەبەران {لە مرۆڤ و لەجنۆکە} کردەوەی لەوە باشتریان نەکردووە.**

١٩٩. أنَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« إِنَّ الْعَبْدَ لَيَبْلُغ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ »
(المعجم الاوسط)

**واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:**

**بێ گومان و زۆر بەدڵنیاییەوە بەندە بەهۆی ڕەوشتی جوانی یەوە دەگاتە پلەوپایەی ئەوکەسەی کە هەمیشە بەڕۆژووەو، بەهەمیشەش شەو بێدارەو (شەونوێژ دەکا).**

٢٠٠. أنَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« عَلَيْك بالرِّفْقِ فَإِنَّ الرِّفْقَ لَا يَكُونُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ وَلَا يُنْزَعُ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا شَانَهُ ». (الأدب المفرد).

**واتە: خۆشەویستمان - سەلامی خودای لەسەربێت- بەخاتوو عائیشەی دایکمانی فەرموو:**

**ئامۆژگاریت دەکەم کە دەست و دڵ بگری بە ناسکی و نەرم و نیانییەوە، چونکە نەرم و نیانیی لە هەرشتێکا بێت دەیڕازێنێتەوەو، لە هەر هەرشتێکیش دابماڵرێ ئیللا دزێوو ناشیرینی دەکات .**

٢٠١. أنَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« لا يَسْتَقِيمُ إِيمَانُ عَبْدٍ حَتَّى يَسْتَقِيمَ قَلْبُهُ ، وَلا يَسْتَقِيمُ قَلْبُهُ حَتَّى يَسْتَقِيمَ لِسَانُهُ » . (مسند أحمد)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
بێگومان باوەڕی هیچ بەندەیەك ڕێك وپێك و ڕاست و ڕەوان و تێرو تەواوو دامەزراو نابێت هەتا دڵەكەی ڕاست و ڕەوان و دامەزراو نەبێت، وە هەرگیز دڵەكەشی ئارام و ڕاست و دامەزراو نابێت هەتا زمانی هاوسەنگ و ڕێك و ڕاست نەبێت.

٢٠٢. أنَّ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« مَا مِنْ جُرْعَةٍ أَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ جُرْعَةِ غَيْظٍ كَظَمَهَا عَبْدٌ ابْتِغَاء وَجْهِ اللَّهِ ». ( إبن ماجة )

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەربێت دەفەرموێ:
هیچ قومە خواردنەوەیەك لەلای خوا لەخواردنەوەی ڕق و تووڕەیی بەندە گەورەتر نیە كەتەنها لەبەرخواو بۆ ڕەزامەندی خوا تووڕەییەكەی خۆی دەخواتەوەو (هەڵوێستی ناشایستە نانوێنێ).

٢٠٣. أنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:
« إِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ قَائِمٌ فَلْيَجْلِسْ فَإِنْ ذَهَبَ عَنْهُ الْغَضَبُ وَإِلاَّ فَلْيَضْطَجِعْ » (سنن ابي داود)

واتە: خۆشەویست سەلامی خودای لەسەر بێت دەفەرمووێ:ئەگەر یەکێکتان تووڕە بوو و لەوکاتەشدا ڕاوەستا بوو بادابنیشێت، ئەگەر بەم دانیشتنەی تووڕە بوونەکەی ڕەویەوە باشە، ئەگینا با پاڵکەوێ.

تێبینی // لە کۆی ئەو فەرموودانەی کە باس لە تووڕەیی مرۆڤ دەکەن و چارەسەریان بۆ دیاری دەکات دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە کەسی تووڕە بوو دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوە جێبەجێ بکات:

١- بەر لەهەرشت چەندین جار بڵێت: أعوذ بالله من الشيطان الرجيم.

٢- بۆ چەند ساتێك بێ دەنگ بێت.

٣- ئەگەر ڕاوەستابوو دابنیشێت.

٤- ئەگەر دانیشتبوو پاڵکەوێت و ڕوومەتەکانی بخاتە سەر خۆڵ یان سەر زەوی.

٥- وەختێ دەم و چاوو ڕووخساری سوور بۆتەوە مانای ئەوەیە گەرم داهاتووە و گەرماییش لەئاگرەو شەیتانیش لەئاگرە، ئاگر بەئاو سارد دەبێتەوەو دەکوژێتەوە، کەواتە با دەستنوێژێك بگرێت و ئەگەر توانی دوو ڕکات نوێژیش بکات و داوای یارمەتی لە خوا بکات کە بەهانایەوە بێت.

وصلى الله على سيدنا وحبيبنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

هەولێر / ٢٠١١



خۆشەویست جوانترین و هەستیارترین نموونەو
پێشەنگی پەیام و بەرنامەی خودابوو
لەجێبەجێ کردنا، بە چەشنێك تەواوی هەست و
نەست و دڵ وگیان و هەڵوێست و هەڵسوکەوت و
گوفتارو ڕەفتاری ڕۆشنکەرەوەی پەیام و
بەرنامەکەی خودا بوو، پێغەمبەرێکی مەزنی وەها
کە هەم ڕابەری گۆڕانکاری بوو لە خۆی و هەم
ڕێنیشاندەری گۆڕانکاری بەخێری دەروونی و
ژیانیش بوو بۆ مرۆڤایەتی .